# دیوانی تاهیر بەگی جاف




## شاعیری دڵ تەڕ و شیرین زمان

کۆکردنەوە و ساغ کردنەوە و ئامادە کردنی :

حەسەن گۆران

# دیوانی

# تاهیربەگی جاف

---

شاعیری دڵتەڕ و شیرین زمان

کۆکردنەوە و ساغ کردنەوە و ئامادەکردنی

حەسەن گۆران

جاف، طاهر بیگ، ۱۸۷۸ - ۱۹۱۸م.
دیوانی تاهیربەگی جاف /کۆکردنەوە و ساغ کردنەوە
و ئامادەکردنی حەسەن گۆران ـ«ویرایش» ـ سنندج
حسن گۆران، ۱۳۸۱ ـ ۱۸۵ص
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا. ISBN 964-06-1118-2
۱ ـ شعر کردی -- عراق -- قرن ۱۹م ۲ ـ شعر فارسی
-- قرن ۱۳ق، ۳ ـ جاف طاهربیگ، ۱۸۷۸ ـ ۱۹۱۸م.
نقد وتفسیر: الف، حسن گوران. ۱۳۳۹ گردآورنده.
ب. عنوان. ۲ج ۲۴۳آ / ۳۲۵٦ PIR ۹/۲۱ فا ۸
کتابخانه ملی ایران: ۱۲۴۲ ـ ۸۱م

## لە چاپکراوەکانی:

## دەزگای رۆشنبیری گۆران

### ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب: دیوانی تاهیربەگی جاف
- کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: حەسەن گۆران
- ناشر: دەزگای رۆشنبیری گۆران
- وێنەکێش: هونەرمەند هادی زیادینی
- کۆمپیوتەر: کاک ناسیح رەحمانی
- نەوبەتی چاپی یەکەم: ۲۷۰۲ی کوردی
- نەوبەتی چاپی دووهەم: ۲۷۱۱ی کوردی
- هەژماری چاپی یەکەم: ۳۰۰۰ بەرگ
- هەژماری چاپی دوهەم: ۳۰۰۰ بەرگ
- شابک: ۲ ـ ۱۱۱۸ ـ ۰٦ ـ ۹٦۴ / ISBN 964-06-1118-2

مەنعی مەکە تاهیر، کە ئەگەر مات و خەمۆشە
دێوانەیی رووی تۆیە، نە مەستی مەی وبەنگە

روز روشن به غریبان چون شب تار بود
خوشتر از گل به جهان، نشتر خار وطن است

فەلەک زانی کە دەشکێ رەونەقی بازاڕی مانگ و خۆر
شکاندی پەنجەکەم تا من نەنووسم وەسفی روخساری

# ئەم بەرهەمە:

پێشکەش بەو کەسانەی وا لە رێگای خزمەت بە
ئەدەب و هونەر و کەلەپووری گەلەکەیاندا
بێوچان لە هەوڵ و تێکوشاندا بوون

# بەتایبەت

پیرەمێردی نەمر، شاعیر و فەیلەسووفی کورد
کە هەموو ژیان و حاڵ و ماڵی خۆی
لەم رێگەدا بەخت کرد و
ئەو کەسانەی کە درێژەدەری رێگای ئەوانن

## هەروەها

به یادی ئەو هونەرمەندانەی

که بەدەنگی گەرم و نەرم و زوڵاڵیان

شیعرەکانی تاهیربەگ

دەبەنە ناو ماڵ و دڵی میللەتی کوردەوە

دیسان پێشکەش به دەنگی

هونەرمەندان

سەیید عەلی ئەسغەر، عەلی مەردان،

حەسەن زیرەک، مەزهەری خالقی و...



وێنەی تاهیر بەگی جاف لە جلو بەرگی کوردی جافیدا. بە قەڵەمی هونەرمەند کاک هادی زیادینی.



وێنەی تاهیر بەگی جاف بە قەڵەمی هونەرمەند حەننانە عەلیخانی.



عادیله خانم خێزانی وەسمان پاشای جاف لە گەڵ دوو کوڕی خویدا بە ناوی زاهیر بەگ‌و ئەحمەد موختار بەگی جاف.

## « ناوەرۆک » ، « فهرست »

## « ناوەرۆکی بەشی کوردی »

# پێشەکی

بۆ شاعیرێکی شیرین کەلام و دڵتەر و شیرین زمان وەکوو تاهیربەگ ئەبوایە زووتر هەوڵ بدرایە شیعرەکانی بە رێک و پێکی و بەشێوەی رێنووسی ئەمڕۆژ لەچاپ بدرایە، (١) بەڵام بەداخەوە دەیان ساڵە هەر بەو شێوە کۆنە دەیان جار لە چاپ دراوە و خاوەن چاپەمەنی‌یەکان خۆیان ماندوو نەکردوە هەوڵی چاپێکی نوێ بدەن، بۆیە زۆربەی شیعرەکانی بە هەڵە رۆیشتوونەتە ناو ماڵ زار و دڵـی خەڵکەوە، بە هەر شێوەیەک نووسرابێت هەر بەو جۆرە خوێندراوەنەتەوە و بەو شێوەیەش لەبەرکراون، ئێمە بە جوانی هەستمان بەوە کردبوو بۆیەکەوتینە هەوڵ و تێکۆشانێکی بێ‌وچان تا بەڵکوو بەرهەمی چەند سـاڵە و جگـەرگۆشەی ئـەم شاعیرە بەناوبانگەی کوردە تا رادەیێک بە رێک و پێکی بیخەینە ناو کتێبخانەی کوردیەوە، بۆ ئەم کارە گرینگە لە پێشان هەڵبەستە کوردی‌یەکانیمان هـێناوەتە سەر رێنووسی کوردی و شیعرە فارسی‌یەکانیمان راست کردوەتەوە (٢)، پاشان ئەوانەی کە هی تاهیربەگ نی‌یە لە دیوانەکەیا دەرمانهێناوە و لە دوایی داکەوتینە دۆزینەوەی شیعرە لەچاپ نەدراوەکانی و تەخمیسی شاعیران لەسەر هەڵبەستی

---

١ - دیوانی تاهیربەگ لە ساڵی ١٩٣٦ی ز لەچاپ دراوە و هەتاکوو ئێستا گۆرانکارێکی زۆر بە سەر چاپەمەنی‌دا لە لایەک و رێنووس و رێزمانی کوردی لە لایەکەوە هاتووە بەڵام بە داخەوە هیندێ لە خاوەن چاپەمەنی‌یەکان تەنیا چاویان لە گیرفانی خۆیانە و نـازانـن خـاوەن بەرهەم چەندە زەحمەتی کێشاوە، وەکوو نالی ئەفەرموێ: بەرهەمەکانیان جگەرگۆشەیانە.

٢ - زۆربەی هەرەزۆری شیعرە فارسی‌یەکانی تاهیربەگ بە هەڵە لە چاپ درابوو، جا ئەگەر فارس زمان یان فارسی‌زانێ دیوانە کۆنەکەی تاهیربەگی بدیبایە بە شاعیرێکی کز و لاواز، کە قافیە و وەزن و مانای ووشەی نەزانیوە دەزانی، بۆیە ئەمەیش زوڵمێکی گەورەیە لە ئـەدەبی کوردی، بەتایبەت تاهیربەگ. پێویستە بڵێن هیچ لێکۆڵینەوەیەکمان لەسەر شیعرە فارسیەکانی تاهیربەگ نەکردووە تەنیا هەڵەکانمان راست کردونەتەوە و دروستەکەیمان نووسیوە.

تاهیربەگ، پاشان بەشێوەی پیتی «ئەلف و بێ» واتا «حروف الفبا»، بۆیە گۆڤار و بەیاز و دیوانی شیعری شاعیران و هەر کتێب و نامیلکەیەک لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردەوە باسێکی تاهیربەگی کردوە بەجوانی لێکمان داونەتەوە، هەروەها گەرانێکی زۆر بۆ ئەملا و ئەولا بەتایبەت سلێمانی و هەڵەبجەی شەهید و سەیید سادیق کە جێی ژیان و ئیلهامی شیعرەکانی تاهیربەگ بوون و ئەم بەرهەمە هاتوتە دەر، پاشان چەند کەسێکی شارەزا چاوی پێداگێراوە بە تایبەت بەرێزان کاک عەتای حەواری‌نەسەب کە شیعرەکانی لەگەڵم راست کردەوە و ماندوونەناسانە یاریدەرم بوو، بەراستی لەگەڵ کاک عەبدوڵڵای حەواری نەسەبی برای، دڵسۆز و شارەزایەکی کەموێنەن لە ئەدەبیاتی کوردیدا و بۆ ئەم ئیشە گرینگە زۆر هاندەر و یاری‌دەرم بوون هەروەها مامۆستا سەباح بەرزنجی لە سلێمانی کاک خالید مەنسووری و مامۆستا ئەهوەن و کاک حەمەشەریف عەلی‌رەمایی «بێسارانەیی» لە شاری سنە کە لێرەدا پر بەدڵ سپاسیان دەکەم، تا بەڵکوو دیوانی ئەم شاعیرە شیرین کەلامە کە بریتی‌یە لە کوردی «سۆرانی و هەورامی» و فارسی و تاک و تراکێکیش تورکی، تا ئەو جێگایە کە توانیبێتمان بێ هەڵە و کەم و کۆری بیخەینە بەر دەستی هەستیارانی هۆنراوەی کوردی. جا ئێمە لەسەر ئەو باوەرەین کە ئەم بەرهەمە بێ هەڵە و کەم و کۆری نابێت، بۆیە داواکارین لە خوێنەرانی وردبین ئەگەر هۆنراوەیەکیان دەستکەوت وە یان هەڵەیەکیان وەبەرچاوکەوت بۆمانی بەرێ بکەن تا لە چاپەکانی داهاتوودا کەم و کۆریەکانی راست بکەینەوە.

سپاسی مامۆستا حەمەرەشی ئەمینی لە شاری پاوە دەکەم کە سێ پارچە شیعری فارسی تاهیربەگی بۆ ناردین ئێمەش لەم چاپی دووهەمەدا لەچاپمان داوە.

**بە سوپاسێکی زۆرەوە.**

**حەسەن گۆران سنە ۲۷۰۲ی کوردی.**

# تاهیربەگی جاف کێیە ؟

شۆخ و شەنگی بنەماڵەی جافان، شاعیری دڵتەری دەستەی دڵسافان، پەردەی نازکی بیر و باوەری تەلی تاری کۆری ئاهەنگی بووە. پەراوێزی ئاسمانی خەیاڵاتی ئەستێرە زێرینەیەکی غەرامی بووە، بادەنۆشی دیواخانی مەی‌نۆشان لە ستایشی مەهـ وەشاندا، گوڵەوچنی پۆلی گوڵچینان لە باسی باخچەسەرای نازداراندا. لە بەهەشتی دەشتی شیعرا شۆرەسوارێکی بەدیمەن، لە سروشتی وەشتی عەشقا بەشدارێکی دەوڵەمەن. گاهێ بە سۆزی شمشاڵی وتەی لاهووتی دڵی دەروێشان ئەکاتەوە، گاهێ بە دەنگی روبابی شیعری ناسوتی دڵی سەرخۆشان تەداتەوە. شیعری رەوان و بێ گرێ، زۆرتر کە بادە بی‌گرێ. سازێ ئەدا بەگوێ گران، سۆزێ ئەدا بەگوێ گران !!... (١)

تاهیربەگی جاف کوری وەسمان پاشای کوری موحەممەد پاشای کوری کەیخوسرەو بەگی کوری سلیمان بەگی کوری قادربەگی کوری زاهیربەگی یارئەحمەد بەگی جافە کە لە عەشیرەتی جافن. دایکی ناوی عادیلە خانمە و کچی قادربەگی ساحێبقرانە، کە لە بنەماڵەیێکی گەورەی سنە بوون، تاهیربەگ لە ساڵی ١٨٧٥ی زایینی لە شاری هەڵەبجەی شەهید لەدایک بوە و لە تەمەنی حەوت ساڵی‌دا دەنێردرێتە بەر خوێندن بۆ فێربوونی قورئانی پیرۆز و کتێبی شاعیرانی فارس و کورد وەکوو سەعدی، حافیز، شێخ رەزا، نالی، باباتاهیری عوریان و هەتا دوایی، هەروەها عەرەبیش کە لە حوجرەی فەقیەکانی کوردستان دەبێ فێری بین بە جوانی فێری دەبێ.

تاهیربەگ لەبەر ئەوە بنەماڵەی دایکی لە سنە بووە و خاوەن عیلم و زانست

---

١ ـ مێژووی ئەدەبی کوردی علاالدین سەجادی چاپی ١٩٥١ی ز لاپەرە ٤٦٩.

ئەبن جارجار هاتووچوی سنە ئەکات کە ناوەندی عـیلم و زانست دەبـێ. جـا لێرەدا بەم بۆنەوە تاهیربەگ هان ئەدرێ زۆرتر لەگەڵ خوێندنا خۆی خەریک بکات و لەگەڵ پیاوە خاوەن عیلم و زانستەکانی ئەو سەردەمە دائەنیشێ و زیاتر لەگەڵ زانستدا ئاشنا ئەبێ، تاهیربەگ بە هۆی دەسـەڵاتداریـی بـەریتانیا لە کوردستان زمانی ئینگلیزیش فێر ئەبێ و لەگەڵ زمانی فەرانسەوی ئاشنایی پەیدا ئەکا. دەربارەی تاهیربەگەوە مامۆستا عەلادینی سەجادی لە مێژووی ئـەدەبی کوردی لاپەرەی ۴۷۴ دەڵێ:

تاهیربەگ پیاوێکی کورتە باڵا و زەررە شیرین بووە، سوور و سپی و مـوو زەرد و مێ چاو بووە، دەم و چاوی درێژکەڵە و ریشی ئەتاشی، جل و بەرگی کوردی بووە، کەوا و سەڵتەی جوانی لەبەر ئەکرد و چەفتە و مشکی لە سـەر ئەبەست لە لەشدا لاواز بووە، دڵتەر و سوارچـاک و تـفەنگچی بـووە راو و شکاری زۆر پێ خۆش بووە، زۆر ئاشنا بووە بە خواردنەوە بۆ ئەوە لە ئێش و ئازاری ژیانی بێئاگا بێ. خۆشەویستیی تـاهیربەگ لە نـێو روونـاکبیرانـدا تـا رادەیەک بووە کاتێ کە لە نەخۆشخانەی سلێمانی ئـەبێ سـلێمانبەگ، کـاتبی فارسی لە ناخی دڵەوە ئەو شیعرە بەرزەی بۆ ئەنووسێ:

ای وجودت میمنت بخش قضای شـهر زور (١)
وی سعادت از تو شد مسـعود گـیتی پـر ز نـور
سـایهٔ تـو از شـرف بـالاتر از ظلّ هُـماست
سایەات بر هـر کـه افـتد شـاه گـردد بی فـتور

---

١ ـ هەڵەبجەی شەهید و کویت هەردووکیان لە یـەک رۆژدا بـوون بـە قـەزا واتـە «فەرمانداریی»، کویت بووبە وڵات بەڵام هەڵەبجە...

ابــر نـیسان مـنفعل از ریـزش احســان تــو
زان سبب نالد بخود ریـزد ز دیـده اشک سـور
ای براین اوصاف گشته متصف «طاهر» ز عیب
پـــاسبان درگـــهت اسکــندر و بــهرام گــور
مردم آنجا ز حسـرت جـمله دل ریش و مـلول
روز و شب بـهره شــفا، نــالان بــدرگاه غـفور
اهل بازار از فتاح بگ، حاجی لیلان، شیخ حسین
بندۀ خاص خودت حاجی علی و درویش سور
هــر یکــی بــهر شــفایت کــرده مــولود نـبی
تــا بیابی راحت از جــور زمــان، رنج و دهـور
دفع آزار تـو مـیخواهـند مـردم خـاص و عـام
در امـــان لطــف بـــاشید تــا یــوم‌النشــور
الف قــدم نــون شــد از حســرت رنـجوریت
گر «سلیمان» بودم اکنون تن ضعیفم همچو مور

دۆستی خۆشەویستم مامۆستا حەکیم مەلا ساڵەح کە بە بنەماڵە خەڵکی شاری هەڵەبجەی شەهیدن دەڵێ لە پێشوان بیستوومانە لە بەرانبەر ماڵی پاشاوە «وەسمان پاشای جاف» کانی‌وئاوێک هەبووە بە ناو «کانی‌نواڵە» کە خەڵکی بۆ ئاو هێنان دەرویشتن بۆ سەر ئەو کانی‌وئاوە. لە هەڵەبجە کابرایێکی جوولەکە هەبوو بە ناو «شاوڵە کەری زێرنگەر»، شاوڵەش کچێکی جوانی‌ دەبێ بە ناوی «شێوە» هەموو رۆژێک بۆ ئاو هێنان دەرویشت بۆ سەر ئەو کانی‌وئاوە، تاهیربەگیش هـەموو رۆژێک لەبەر هەیوانی ماڵەکەیاندا تەماشای بەژن و باڵای شێوەی دەکـرد و ئەوینی لە دڵی‌دا جێگای تایبەتمەندی گرتبوو بۆیە شیعرێکیشی دانابوو بە ناوی

«بە غەمزەی چاوی مەخمووری...» بۆ ئەو کاتانەی کە شێوە دەچوو بۆ سەرکانی و گۆزە ئاوی پڕ دەکرد. دەڵێن ئەم شیعرەشی پیشان کاکە حەمەی بێلوو «ناری» داوە و زۆری پێی جوان بووە. مامۆستا حەکیم دەڵێ باب و باپیرانمان و زۆربەی خەڵکی هەڵەبجە ئەو شیعرەیان لەبەرکردبوو، هەمووانیش دەیانزانی چلۆن و بۆ کێ وتراوە. تاهیربەگ دەنێرێتە خوازمێنی شێوە، شاولەی بابیشی بە دوو هۆ ڕەزامەندی خۆی دەردەبڕێ، یەکەم لەبەر ئەوەی تاهیربەگ و شێوە یەکتریان خۆش ویستووە، دووهەم چونکوو لەکوردستان جوولەکەکان لە لایەن موسڵمانانەوە ئازاریان پێی دەگەیشت، ئەم پێوەندیە ئەوانی لە ئازار و دەسدرێژی بۆ سەر حاڵ و ماڵیان دەپاراست. بەوجۆرە شێوە دەبێتە ژنی تاهیربەگ و چەندین منداڵی لێی دەبێ، پاش کۆچیدوایی تاهیربەگ و پاشان دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل، شێوە لەگەڵ منداڵەکانیدا بەرەو ئیسرائیل کۆچ دەکەن و لەوێ دەمێننەوە.

تاهیربەگ زۆر زیرەک و ئازا و وردبین دەبێ هەرچەند حەزی لە سیاسەت نەبووە بەلاّم خوێندەوارێکی چاک و لێزان بووە، کاتێ کە «میجەرسۆن»ی ئینگلیزی لەساڵی ١٩٠٩ی زایینی بۆ سیخوری «جاسووسی» دێتە کوردستان و ماوەی شەش مانگ بە ناوی غولاّم حوسەین لە ماڵ وەسمانپاشای جاف دەبێ و کار دەکا، ڕۆژێ لە ولاّمی تاهیربەگدا کە پرسیارێکی لێ دەکا لە جیاتی ئەوەی کە بڵێ «نە» دەڵێ « No نۆ» جا لێرە دەبێ تاهیربەگ دەزانێ ئەم کابرایە کورد نییە و بێگانەیە، میجەرسۆن لە یادداشتەکانی خۆیا باسی تاهیربەگ دەکا و دەڵێ: کەس نەیزانی من کێم جگە لە تاهیربەگ بەلاّم پیاوانە و ماقولاّنە منی لە ماڵی خۆیاندا وەدەر ناو نەیهێشت کەس پێم بزانێ. بە داخەوە تا ئێستا دەستخەتی

تاهیربەگمان وەدەست نەکەوتووە [1] تاکوو بزانین شێوە خەتی چلۆن بووە چونکوو تا رادەیەک پلەی خوێندەواریی و زانستی بۆ ئێمە روون دەبووەوە. بۆ ئەم مەبەستە گرینگە مێژوویە ئەوا دەچینە ناو باخچەی گوڵزاری ئەدەبی وجاخی خانەدانی جاف و شیعرەکانی تاهیربەگ و بە ئەسپایی ڕێگا دەپێوین و بۆ ناساندنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبیی شاعیری پایەبەرز تاهیربەگ و پلەی بیری ئەدەبیاتی وا قەڵەم دەنێنە سەر کاغەز:

ژیانی تاهیربەگ زۆرتر بە شیعر و ئەدەب و ڕاو و خواردنەوەوە [2] بەسەرچووە حەزی لە کۆڕ و کۆبوونەوە بووە لە کۆڕی شیعر و ئەدەبەوە بگرە تاکوو کۆڕی مەی خواردنەوە، تەنانەت لە کۆڕی قوماردا بەشداری کردووە نە بۆ یاریی بەڵکوو بۆ ئەوەی بزانێ چلۆنە چوونکوو لە شیعری فارسی «قومار»دا زەممی ئەوانەی کردووە کە خەریکی ئەم شێوە یارییانە بوون، تاهیربەگ لەگەڵ چەند شاعیرێکی هاوچەرخی خۆی بەتایبەت کاکە حەمەی بێلوو «ناری» زۆر

---

١ ـ لە رۆژنامەی هاوڵاتی ژمارە «٣٧»ی یەک شەممەی ٢٠٠١/٨/٢٦ بە هاوکاری بەرێز مامۆستا سەباح بەرزەنجی مامۆستای زانکۆی سلیمانی ئاگاداریيەکمان بلاّو کردەوە و داوامان لەو کەسانە کرد هەر شتێکی پێوەندار «شیعر، پەخشان، وێنە و دەسنووس» بە تاهیربەگیان لایە بۆمانی بنێرن بەلاّم تاکوو ئێستا هیچ شتێک لەم بارەوە بە دەستامان نەگەیشتووە جا ئەگەر لە دوایی بە دەستمان گەیشت لە چاپەکانی داهاتوودا چاپ و بلاّوی ئەکەینەوە.

٢ ـ مامۆستا عەلادینی سەجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردی لاپەرەی ٤٧٤ دا دەڵێ:

زۆر ئاشنا بووە بە خواردنەوە بۆ ئەوەی لە ئێش و ئازاری ژیانی بێ ئاگا بێ. بەراستی هەر وا بووە چوونکوو زانایان بۆ ئەوەی لەگەڵ خواردنەوە خۆیان خەریک ئەکەن کە دەرد و مەینەتیی ژیان و خەڵک زۆر ئازاریان ئەدات، مەی خواردنەوە شێوە دەرمانێکە بۆ دەردەداران.

نێوانی خۆش دەبێ و شیعر و نامەی بۆ ناردووە، ئەم هۆنەرە هۆنراوەی زۆری بە زمانی کوردی و فارسی داناوە کە بە داخەوە بە هەوڵێکی زۆرەوە توانیمان هەر ئەمانەی لەم دیوانە ببینینەوە و پاش دەیان ساڵ «چونکوو یەکەم چاپی لە ساڵی ١٩٣٦ی زایینی لە چاپخانەی ژین لە سلێمانی بوو» لە چاپی بدەین. تاهیربەگ لە ساڵی ١٩١٧ی زایینی بەرانبەر بە ١٣٣٧ی کۆچی بە هۆی نەخۆشی دەیبەنە سلێمانی بەڵام لە رێگا لە تەمەنی ٤٢ ساڵیدا کۆچی‌دوایی دەکا و تەرمەکەی لە بناری هەڵەبجە لە گۆرستانی دێی «عەبابەیلی» دەینێژن.

سلێمان‌بەگ، کاتبی فارسی کە لە نزیکەوە لەگەڵ تاهیربەگ و بنەماڵەی جافا دۆستایەتی بووە چەند بەیتێکی بۆ کۆچی‌دوایی تاهیربەگ داناوە کە ئاخری مەسرەعی شیعرەکە «جان وی تحت لواء مرسلین» ئەبێتە مێژووی کۆچی دوایی تاهیربەگی جاف یانێ «١٣٣٧»ی کۆچی، شیعرەکەی سلێمان‌بەگ ئەمەیە:

**این چه غوغا ایست یا رب کوفتاده در زمین**
**جمله عالم مات و حیران در لباس ماتمین**
**با وجود فصل «فروردین» (١) چمن همچون خزان**
**گُل ز تن، جامه درید وکرد زاری یاسمین**
**گشت گریان از سما ناهید خندان شد چنان**
**زانکه «طاهر» رفت از دنیا بفردوس برین**
**سال تاریخ وفاتش جستم از حور بهشت**
**گفت برگو «جان وی تحت الواءالمرسلین»**

---

١ ـ فروردین: واتە مانگی گوڵان کە ئەبێتە یەکەم مانگی بەهار

# تاهیربەگی جاف و شیعری کوردیی.

ئەگەر خانەدانی جاف و ئەدەبی کوردی تاهیربەگی نەبووبایە کێ دەیتوانی بەم شێوە بە بەژن و باڵای کیژە سوور و سپی و ناسک و کوڵمە جوان وەک گێلاسەکانی کوردستاندا هەڵبهاتبایە و رێواسە تەرچک و ناسک و ئاودارەکەی کوردەوارییی کە کیژان کاتی بەهاران دەچنە چنینی وا برازاندبایەتەوە، یان کێ بوو شیعری «دڵ نەخۆشی دەردی دووری و هەی نابێ نابێ» بۆ حەزرەتی داوودی کورد «سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی» داناباو و بیکردبایە بەگۆرانی ماڵ بە ماڵی کوردستان بگەرایەت و بچووبایەتە ناو دیواخانی گەورە ماڵان و لە گۆشەی دڵی خەڵکەوە ئوقرەی بگردایە، یان کێ دەیتوانی تانە لە فەلەک بدات بۆ ئەوەی پەنجەکەی شکاندووە ئەگینا وا وەسفی یارەکەی بکردبایە بازاری مانگ و خۆری بێ رەونەق دەکرد، ئەگەر تاهیربەگ نەبووبایە کێ بوو بە حافیزی شیرازیی بڵێ تۆکە شانازی دەکەی سەمەرقەند و بوخارا دەبەخشی بە خاڵی لێوی یارەکەت منیش سەروەتی حکوومەتی بابانم هەیە بیبەخشم بە ماچی لێوی کچە کورد، جا ئەگەر تاهیربەگ قەڵەمی بە دەستەوە نەدەگرت تەکیە و خانەقاکانی کوردستان لە شیعری «مەتلەعی سوبحی سەعادەت...» بێوەری دەبوون.

ئەگەر مرۆڤ، شیعر و گۆرانی نەبووایە لەمێژ بوو هەست و دڵی پر لە ئەوینی مردبوو، جێژوانان چۆڵ و دارە شین و سەوزەکان سیس و ژاکاو دەبوون، دەنگی مەل و قاسپەی کەو و قارە قاری قەل لە لای، یەک مانای هەبوو، کێ بە جوانی و جوانپەرستی هەڵبهاتبایە و وەسفی سروشتی بکردبایە؟ بەکوردی و کورتی ژیان مردبوو.

ئەگەرکورد تاهیربەگی نەبووبایە باخچەی شیعر و ئەدەبیاتی لەو هەموو گوڵە

رەنگا و رەنگە بۆن‌خۆشە و وەسفی ئەگریجە و پەرچەم و لەولاو بێوەری دەبوو. ولاتی کوردەواری و گەلەکەی بۆیە زیندوە و قەت نامرێ ئەدەب و هونەری زیندوە، جا بۆچی ئەدەب و هونەری زیندوە؟ چونکوو خزمەتکاری زۆرە، هەم مەلەوانی کارامە و هەم ئاوی زولاڵی فرەی هەیە، شاعیر و نووسەر و ئەدیبی کوردەواریی سەف بە سەف وەستاون بۆ خزمەت کردن، کوردستان بە هۆی جوگرافیایەک تایبەتمەندی‌یەوە کە هەڵکەوتووە لە نێو شاخ و کێو و دەشت و باخ و چر و دارستانی رەنگاورەنگ، هەبوونی داب و نەریتی شیرین و جوان و کۆن، مێژوویێکی پر لە شانازی و خوێناوی، دەریای لە بن نەهاتووی ئەدەب و فۆلکلۆر و هونەری لە خۆی‌دا حەشار داوە، هەر خاوەن هەستێک هاتووە ئاوی لێ دەرهێناوە و لە بن دارێکی رشتووە و کەس کاری نەبووە دار چلۆن بەری گرتووە، تەنیا خواردوویانە و پرژاندوویانە و نەیان پرسیوە و نەیانویستووە چی لێ بەسەر دێت و لە دوایی چی بۆ داهاتووان بەجێ ئەمێنێ، لێرەداگەورەماڵان نە تەنیا دەورێکی باشیان لە پەرەپێدانی‌دا هەبووە بەڵکوو لەناوچوونی بەرگریشیان کردووە و پاراستوویانە، یەکێ لەو گەورە ماڵانەکە جێگا پەنجەی خزمەتیان زۆر دیارە بنەماڵەی جافە، ئەم بنەماڵە وەکوو کتێبخانەی گشتی بووە بۆ کوردستان، هەمیشە خاوەن عیلم و زانستیان خۆش ویستووە و رێزیان لێ گرتوون و دەستیشیان گرتوون، لە نێویشیاندا زاناگەلێک هەڵکەوتووە کە مێژووی ئەدەبی کوردی شانازیان پێوە ئەکات، تاهیربەگ و ئەحمەد موختاربەگ لەو بنەماڵەن کە خاوەن بیر و هەست و قەڵەم بە دەست بوون، ئەحمەد موختار جاف بیر و هۆنراوەی شۆڕشگێرانە و تاهیربەگ ئەدەبی لە خزمەت ئەدەب و سروشت و جوانی‌دا بووە، تاهیربەگ لە نێو سیاسەتدا بەشداری نەکردوە چونکوو سیاسەت دڵێکی وەک بەردی ئەوێ، جا تاهیربەگی

دڵ ناسک و ئەویندار چلۆن دەیتوانی سیاسەتمەدار بێت؟ بەڵام لێرەدا سەد مخابن کە زۆربەی شیعرەکانی تاهیربەگ دیار نین ئەگینا شیعری دڵداریی هەموو شاعیران لە تەرازوویەک و شیعری تاهیربەگ لە لایک بەتەنیا سەنگینی تەرازووی سەری وانی لە عەرش ئەدا و مێژووی ئەدەبی کوردی شانازی پێوە دەکرد و سەد هێندە بەرزتر دەبوو، ئێستا باسەکەمان باسی تاهیربەگ و هۆنراوەکانیەتی. کە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا جێگای تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەم شاعیرە لە هۆنراوەکانیدا «کوردی و فارسی» هەستوبیری خۆی بەجوانی بۆ ئێمە روون دەکاتەوە. لێرەدا دەچینە ناو دڵی شاعیر و تا ئەو جێگایە کە لە تواناماندا بێت لەمبارەوە لێدەکۆڵینەوە و دەیناسێنین.

## تاهیربەگی جاف و شیعری دڵداریی

ئەگەر کاکە مەم نێرگزی دیاری کردووە بۆ خاتوو زین، شەمی هاواڵی شەوانی ئاشقان رووناکیی چاو بە فرمێسکی خۆی بۆ پەپوولە کردوە بە دیاری، ئاخۆ تاهیربەگی دڵتەڕ و دڵ پڕ لە ئەوین کامە شیعری وەکوو گوڵە بۆن خۆشەکانی دەشت و چڕ و چیای کوردستان چەپکە کردووە بە دیاری ناردوویە بۆ دڵدارەکەی؟ با نەچینە بەر سەراوی کانی و ئاوی هەڵەبجە کە جێ ژوانی هەزاران ئاشق بووە، بەڵکوو گەشتێ دەکەین بە باخچەی بەر ماڵی خانەدانی جافا، تۆ بڵێی کامە کچە کوردی سوور و سپی کە کوڵمی وەکوو گێلاسی سەر پۆپەی داری بەر باخچەی ماڵی خانەدانی جاف دڵی تاهیربەگی رفاندبێت ؟

**سوور و سپیی و ناسکە، وەک چووزەرە رێواس**
**ئاودار و تەڕ و تازەیە کوڵمەی وەکوو گێلاس**

ئەم شیعرە تەنیا دەتوانێ لە دڵی تاهیربەگی ناسک خەیاڵ بێتە دەر و بەس:

شاعیر کاتێک خورد و خوراکی ئەوەیە لێوی یاری خۆی کە شەهد و هەنگوێنە بمژێ وا قەڵەم بەکاغەزا دەنێ:

مــەکــە مــەنعم لە شــەهدی لێــوی ئــاڵت
دەزانــی خــۆکـەکـەس نـاژی بـە بـێ قـووت

یان کاتێک مەستیی بادە دەیباتە ناو بیر و خەیاڵی یارەکەی، سەرخۆش دەبێ و ئەوینی ئاگراویی مەدهۆش و سەرخۆشی دەکا و شیعرە بەرز و ریئالیسمەکەی کە ناخی گرتووە و ناتوانێ وەکوو سەیید عەلی ئەسغەر و عەلی مەردان دەنگ هەڵبرێ و بەگۆرانی بیخاتە گوێی گوێ گران،کە لە شەوانی مەستی رووی یار بۆی هاتووە نە مەستی بادە:

مەنعی مـەکـە تـاهیر کـە ئـەگـەر مـات و خـەمۆشە
دێــوانـەیی رووی تـۆیە نـە مـەستی مـەی و بـەنگە

جا لێرەکێ یەکە شیعرەکانی تاهیربەگ مەستی نەکاو سەرخۆش نەبێ و خۆی لە جێگای شاعیر دانەنێ، ئەگەرچی فەلەک پەنجەکەی شکاند بۆ ئەوەی وەسفی روخساری یار نەنووسێ نەکا رەونەقی بازاڕی مانگ و خۆر بشکێ، بەڵام هەر دەینووسێ:

فەلەک زانی کە دەشکێ رەونـەقی بـازاڕی مـانگ و خـۆر
شکاندی پەنجەکەم تـا مـن نـەنووسم وەسـفی روخســاری

باسی شیعری دڵداریی تاهیربەگ بەم چەند دێڕە ناکرێ و نابێ لەمە زیاتر لێی بدوین جابۆیە لاپەرە شیعرە بەتام و لەزەتـەکـانی دەنـێنە بـەردەستی خـوێنەر هەتاکوو لە شەوانی بادەنۆشی کە تەنیا شەم و پەروانە بێدارن وێردی زمانیان بێت بۆ ئەوەی زۆرتر بادە بیانگرێ.

# تاهیربەگی جاف و شیعری باسە مێژوویەکان

بێ گومان تاهیربەگ شارەزایی دەربارەی ئەو سەردەمەی جیهان و دونیای رابردووی خۆی بووە لە شیعرەکانیشیدا کاری تێ کردووە، زانیویە بابل ئەو شارە گەورەی دونیای رابردووکە یەکەم قانوونی حەموورابی لە ٢٨٥ مادەکە لێنەوە بناغەی دانرا چلۆن شارێ بووە و خڵکەکەی چلۆن ژیاون بۆیە دەڵێ:

نەماوە شاری بابل چاهی هارووت
لە کوێ خوێندوویە ئەفسوون چاوی جادووت

هەروەها مێژووی حکومەتی بابانی خوێندووە و زانیویە چەندە خاوەن دەسەڵاتبوون و دەخڵ و خەرجیان چەندە بووە ئەگینا قەت باسی تەوانایی حکوومەتی بابانی نەدەکرد.

بە ماچێکی دەبەخشم گەرکەرەم کات
جەمیعی دەخڵ و خەرجی مڵکی بابان

یان کاتێ بە لاپەرەکانی مێژوودا دەگەرێ ئەسکەندەری وە بیر دێتەوە، ئەو جیهانگیرەی کە ناوی لە مێژوودا بەم بۆنەوە سەبت بووە، بۆیە دەڵێ :

نە مەن ماچی لەبی تۆم بووبە قسمەت
نە ئەسکەندەرگەییشتە ئابی حەیوان

ئەسکەندەری مەقدوونی کوری فیلیپووس کە بە یەکەم جیهانگیر ناسراوە گەرا بە دووی ئاوی حەیاتا بەڵام دەستی نەکەوت. وا دیارە مێژووی یۆنانی خوێندوە و بەسەرهاتی ئەسکەندەریشی زانیوە.

تابووری موژانت لەگەڵ ئەگریجە بەرابەر
وەستاوە ئەڵێی لەشکری ژاپوون و فەرەنگە

کەسێ تاکوو مێژوو نەخوێنێ چلۆن باسی ژاپون و ئەوروپا دەکات، جا

لێرەدا دەزانین تاهیربەگ نە تەنیا شاعیر بووە بەڵکوو لێزانێکی شارەزا بووە، کە توانیویە ئێش و ئازاری دونیا قبووڵ بکات بەلاّم لەناو دڵیەوە، بێ ئەوەی لە کەس برەنجێ و کەسیش لێ دڵگیر بێ.

## تاهیربەگی جاف و شیعری ئایینی

تاهیربەگ لە کاتی خەمۆشی شەوانی خامۆشی بادەنۆشانی عیرفان و تەسەوفەوە هۆنراوەی ئایینی دڵی ئارام دەکا و دەروا بۆ میوانی حەزرەتی باری، جاکێیەکە لەم میوانی‌یە مەستی ئەلەست نەبێ و ئەو شیعرە بەرزەی تاهیربەگ لە دڵی کاری نەکات:

**مەتلەعی سوبحی سەعادەت مەزهەری «علم‌الیقین»**
**ئەی سپەهسالاری فەوجی ئەنبیائو مورسەلین**

ئەگەرچی تاهیربەگ وشەی عەرەبی و فارسی زۆری لەم شیعرەدا بەکار هێناوە بەلاّم توانایی شاعیر رۆحی کوردی پێداوە و «کورداندویەتی»، ئەم شیعرە زۆربەی هەرەزۆری عەرەبی‌یە بەلاّم خوێنەر هەست بەوە ناکات وشەیەکی عەرەبیشی تیدابێ.

یان کاتێ ئەشق و ئەوینی بە خانەقا بلێسە ئەکات ناتوانێ خوێ راگرێ و لە وەسفی پەیروانی عیرفان و تەسەوفدا بەم شێوە خوێ ئەنوێنێ:

**مەربووتە حەیاتم بە بیارە و بە دیاری**
**خۆزگەم بە سەگی قاپیەکەی قوتبی مەداری**
**ئەم کاولە دونیایە لە نەو زێر و زەبەر بێ**
**پاش ئەحمەدی موختار و ئەبووبەکر و سێ یاری**

مەعلوومە شاعیر لێرەدا خانەقا و تەکیە و بارەگا ئایینی‌یەکان لایەوە رێزی

تایبەتمەندی هەبووە و حەیاتی خۆی مەربووت بە ئەوان دەزانێ.

تاهیربەگ دەڵێ کاتی پێداهەڵدانی پێغەمبەری خودا دێتە باسەوە کەس وەکوو من پێدا هەڵ نایێ و نەزمی پڕ شەککەرمە:

**نــەعتی شـاهی ئـەنبیا «تـاهیر» کـە هـاتە سـەر زبـان**
**جیلوە بەخشی زەوقە ئیمڕۆ نەزمەکەی پـڕشەککـەرم**

هەر ئەم بەیتە بۆ وەسفی حەزرەتی باری لە دیوانی بەرزی تاهیربەگا بەس بوو.

**ئــەی حـەبیبی خـالیقی عـالەم تـەرەحوم تـا زووە**
**ئەو سەگی ئەسحابی کەهف و من سەگێکی تابیعین**

## تاهیربەگی جاف و شیعری تەشبیهات

قودرەتی تاهیربەگ لە تەشبیهاتا زۆر بووە و کەم شاعیر توانیویە خۆی لە شانی ئەو بدات ئەم بیرورا لە شیعرەکانی‌دا بەتەواوی دیارە چوونکوو ئەگەر ئاوا نەبایە شیعرەکانیشی ئاوا نەدەبوو، ئاخۆ کام قیبلەگا بوویێت میحرابی ئەبرۆی لە تاهیربەگ کەج کردووە:

**دەڵــــێ تــۆراوە قــیبلەی ئــاشقانت**
**کــە ئـەمڕۆکـەچ بـووە مـیحرابی ئـەبرووت**

یان لە جێگایەکی‌ترا دەڵێ:

**حــیکایەت بـوو، لە تـوولی زولفت ئـیمشەو**
**هــەتا جــەمعی رەفـیقان بـوون پـەرێشان**

شاعیر توانیویە درێژایی و رەشیی زوڵفی یاری ئاوا تەشبیە بکات هەتا رەفیقانی لە دەستی‌یەوە پەرێشان و ئاڵۆز بین. دیسان دەڵێ:

**قــوربانی روخت بـم کـە شکسـتی بـە قـەمەردا**
**حـەیرانـی لەبت بـم کـە رەواجـی بـە شـەککـەردا**

کاتێ کە شێت و دێوانەی دیدەی مەستی یار دەبێ نەرگس دێنێتە دیواخانی ئەدەبی شیعری خۆی با تەنیا و بێ هەڤاڵ نەبێ و لەگەڵ خۆی شەریکی دەکا:

**نـــەرگس نـــەحەسرەت ئـــەو دیـــدە مـــەستە**
**چـــون مـــن مـــەبۆ شـــێت دێـــوانە و خـــەستە**

ئەگەر تاهیربەگ هەر ئەم تاکە بەیتەی هەبوایە بۆ قودرەتی شیعریی بەست بوو.

**فەلەک زانی کە دەشکێ رەونەقی بـازاڕی مـانگ و خـۆر**
**شکاندی پەنجەکـەم تـامن نـەنووسم وەسفی روخسـاری**

## تاهیربەگی جاف و شیعری فەلسەفی:

ئەگەر تاهیربەگ فەیلەسووف نەبووبێت حەزی لە فەلسەفە بووە و کتێبی فەلسەفەی خوێندووە بۆیە لەو شیعرە بەرزەی کە پڕی بووە لە پرسیاری فەلسەفی کە بۆ ناری ناردووە تەوانایی خۆی لەم بابەتەوە نواندوە.

**خـــــودا عـــــەدلی لە لای عـــــارف عـــــەیانە**
**بـــە حـــەققەت ئـــێمە گـــەللەین، ئـــەو شـــوانە !**
**لە بـــەرچـی وا مـەڕی خـۆی مـەردی چـوپان ؟**
**بـــــە دەســـــتی خـــۆی ئـــەخاتە بـــەر نـــیشانە؟**

بێ گومان شیعرەکانی خەیامی فارس و باباتاهیری کوردی خوێندووە و کاری تێکردوون بۆیە هەموو مێشکی پڕ بوون لەم پرسیارانە. جـا ئـایا ولأمـی نـاری توانیویەتی تاهیربەگی زانا و خوێندەوار رازی بکات؟!!!

**مـــوقەددەر بـــووکـــە گـــەندوم بـێ بـە رزقـی**
**لە ئـــــادەم بـــــۆ دەبـــــێ بگـــرێ بـــەهانە ؟**

تاهیربەگ وەکوو ئەرەستووی یۆنان هەموو دونیا بە هیچ و پووچ دەزانێ، کاتێ ئەسکەندەری مەقدوونی دێ بۆ سەر ئاسیا پێی دەڵێن قوربان مامۆستاکەت

«ئەرەستوو» هاتووە بۆ ئاسیا دەڵێ بمبەنە لای، کاتێ دەچن دەیبینن لە پەنا دیوارێکا دانیشتووە ئەسکەندەر دەڵێ قوربان من ئەسکەندەرم چیت دەوێ بۆت جێبەجێ بکەم. ئەرەستوو دەڵێ: تەنیا یەک شتم دەوێ ئەویش ئەوەیە کە لە بەر خۆرەتاوەکەم لاچۆ.

**دنیا کە هەموو لەحزە بە مەعشووقی کەسێکە**
**بنوارە کە چەن قەحبە، چ کۆنە تەرەسێکە**
**تێ‌فکرە وەکوو کەلبی نیهان گیری زەمانە**
**ئەبنائی جیهان یەک بە یەک، سەگمەگەسێکە**

یان کاتێ کە باوکی داوای لێ دەکا بچێ بۆ سەیید سادیق و ببێ بە حاکم بەڵام قبووڵی ناکاو پێی خۆشە ژیانی لەگەڵ شیعر و بادە بەرێتە سەر، نەک حاکم بێ بەسەر خەڵکا.

**من رەزا نابم بەنانی گەندومی ئادەم فەریب**
**تۆ ئومیدی کوورەخانەی نانەواخانم ئەکەی**
**من لە شاهی خاوەنی فێڵ و عەلەم پەروام نیە**
**تۆ بە ژێر دەستی پیادە و ئەسپەوە ماتم ئەکەی**

جا ئەگەر تاهیربەگ دڵ بەستەی دونیا بایە هەرگیز نەیدەگوت:

**وەرە «تاهیر» مەبەستە دڵ بە دونیا**
**بە زاهیر جوان و باتین، پیر و فەرتووت**

ئایا ئەم شیعرەی بۆ هەمیشە لە گوێ مێژوودا نازرنگێتەوە و لە مەکتەبی ئیفلاتوون و سیقرات و ئەرەستوو لە ئاکادمیاکەیانا لە ئاتین نەهاتووتە دەر؟

**لەم حوجرەیی شەش گۆشە کە رێ مەعبەری عامە**
**یارەب چیە هەرکەس بە هەواو و هەوەسێکە**

# تاهیربەگی جاف و شیعری فارسی:

تاهیربەگ زۆرتر لە سەبکی هیندیا شیعری وتووە، ئەو هەڵبەستە بەرزەی کە بۆ وەتەن داناوە بەجوانی خۆی نواندووە و سەری لە عەرش دراوە و ئەوپەڕی نیشتمان دۆستی خۆی پیشان دەدا، جا تۆ بڵێی تاهیربەگ شیعری نیشتمانی کوردی نەبووبێ؟!!!

روز روشن بە غریبان چو شب تار بود
خوشتر ازگُل بە جهان، نشتر خار وطن است

لە شیعری فارسیشدا لە دڵداری و ئایینیەوە بگرە تا وەسف و تەشبیهات توانیویە خۆی پیشان بدات، لەو شیعرە بەزە تەوسیفەی دا دەڵێ:

گر تو گلی من بلبلم، از عشق تو نی غافلم
ای شمع بزم محفلم، رحمی بکن پروانە را

بێگومان تاهیربەگ شیعری شاعیرانی گەورەی فارسی وەکو مەولانا و حافیز و سەعدی و خەیام و.. بە جوانی خوێندووە و بیروڕایان کاری تێ کردوون. بەتایبەت باباتاهیری عوریانی کورد کە تەنانەت شێوە شیعری و دارشتنی.

الهی جز تو من یاری نبینم
بغیر از عشق تو کاری نبینم

یان حافزی شیرازی کە دەتوانین بڵێین شەو و رۆژ لەگەڵ شیعرەکانیا ژیاوە.

گو زلیخای دلم را ای عزیزم غم مخور
کاروان مصر با یوسف، زکنعان آمده

کاتێک تاهیربەگ خۆی فەرامۆش دەکات و رۆحی دەچێتە لەشی حەزرەتی

شێخی سەنعان و لەبیری ئەچێتەوە مەربووتە حەیاتی بە بیارە و بە دیاری و ئەمجار روو ئەکاتە رووی تەرسا و وا قەڵەم بەکاغەزدا ئەنێ:

**چـون نـظر بـر رخ و آن زلف چـلیپا کـردم**

**جـــان مــن، آرزوی مــذهب تــرسا کــردم**

جا ئایا ئەتوانین بلێن تاهیربەگ هەر بە تەنیا شاعیر بووە؟

لێرەدا پێویستە بڵێین بەهۆی نائاشنایی کوردەکانی ئەودیو لەگەڵ شیعری فارسی لەو سەردەمەدا زۆربەی شیعرە فارسییەکانی بە هەڵە چاپ ببوون بۆیە هەوڵێکی زۆرمان دا و راستمان کردەوە بەڵام هیچ لێکۆڵینەوەیکمان لە سەری نەکردووە چوونکو بە پێویستم نەزانی. جا ئەگەر هەڵەیەکمان بوو پەڵمان بۆ مەهاوێن و سەرزەنشتمان مەکەن، بەڵکوو بۆمانی دیاری و بەرێ بکەن، بەراستی کەس هەموو شتێ نازانێ هەموو شت هەمووان دەزانن.

**سنە ٢٧٠٢ی کوردی حەسەن گۆران**

# بەشی کوردیی

## لــە دیــوانــی

# تاهیربەگی جاف

«پیتی ـ ئەلف ـ» غەزەلی ژمارە ـ ١ ـ

قـوربانی روخت بـم کـە شکستی بە قـەمەردا [١]
حـەیرانـی لەبت بـم کـە رەواجـی بـە شـەکـەردا
هەر لەحزە ئـەدەی وەعـدەیی وەسڵ و نـیە ئـەسڵی
کــارت وەکـوو دونـیایە هـەر ئـەمرۆیە بـە فـەردا
مـەقسوودی لە سـەرکـوشتنی عـوشاقی زەعـیفە
وەخـتێ کـە دەکـا خـەنجەری تـیژی بـە کـەمەردا
هەرچەندە دەکەم سەعی، لە بـەر خـوێنی سـریشکم
خـاکێ نـیە بیکەم بـە هـەوەس گـاهێ بـە سـەردا
نـاحەق نـیە نـاوەستێ ئـەگـەر پـردی تـەحەممول
سـیروانـی سـریشکم کـە ئـەکـا هـاژە لە سـەردا
دڵ رۆویـوە قـوربان لە وجـوودم بـە خـەیاڵات
دایـم لە سـەفەردایـە ئـەگـەرچـی لە حـەزەردا
مـەیلت هـەیە «تـاهیر» کـە بـپرسی لە بـرینم
بـڕوانـە کـە ئـەو شـۆخە چ تـیری لە جگـەردا

---

١ ـ نالیی لەم شێوە سەبکە شیعرێکی هەیە دەڵێ:

ئەستێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا یا شەمسی جەماڵت شەوی گێراوە بە فەردا؟

پێنج خشتەکی تاهیربەگ لە سەر غەزەلێکی شێخ رەزا
« رۆژێ نەبوو ئەو دولبەرە بێ رەحمە وەفاکا» (١)

غەزەلی ژمارە ـ ٢ ـ

نەمدی کەرەتێک تاقە نیگاهێکی عەتاکا
بەم شاهی یو والایی یە لوتفێ بەگەداکا
لیێ دوورە کە یەک رەسمی موسڵمانی ئەداکا
«رۆژێ نەبوو ئەو دولبەرە بێ رەحمە وەفاکا
جارێ نەبوو ئەو کافرە شەرمێ لە خوداکا»

* * *

من کوشتەیی چاوانم و چاوانی لە من ون
دەرد و ئەلەمیش گشتی بەوە لێم بووە دوژمن
بۆ چاک و شەفاکردنی ئەم دەردە دەواچن؟
«حەیرانن ئەتیبا لە عیلاجی مەرەزی من
لوقمانی ویسالی مەگەر ئەم دەردە دەواکا»

---

١ ـ ئەم تەخمیسەمان لە گۆڤاری سروە دەست کەوت بەڵام ژمارەکەمان لە بیر چوو.
هەروەها زۆربەی شاعیرە بەناوبانگەکانی کورد ئەم شیعرە بەرزەیان تەخمیس کردووە.
شێخ رەزا لە شیعر و قسەدا هیچ باکێکی لە کەس نەبوو هەرکەس خراپ بوایە زەم و هەرکەسێکیش چاک بوایە مەدحی دەکرد، سەداقەت لە شیعرەکانیدا مەعلوومە، بۆ نموونە بروانە دیوانی شێخ رەزا، مەدح و زەمەکانی و مەبەستی، بۆکێ و بۆچی؟

کـاتێکی کـە پـیێ نـایە رکـێف، تـاو لە خـەمی مـرد
رۆیشت و خـەم و فـیکرمی بـا دڵ لە گـەڵی بـرد
ئـێسکی لەشـی مـن گشـتی لە ژێـر بـاری فیراق ورد
«کـارێ کـە غـەم و دەردی فـیراقـی بـە مـنی کـرد
سـەرما بـە هـەتیو، بـا بـە دەواری شـڕی نـاکـا»

* * *

ئـاشق کـوژ و جـەبباره بـە دوو دیـدەیی کـەحلی
سـەد حـوری سـەری شـۆڕە لە بـەر قـامەتی نـەخلی
جـێ فـەخره لە بـۆ دەم، کـەببۆسێ کـەفی نـەعلی
«دێـوانـەیە شـەخسێ کـە بـە غـەیری لەبـی لەعـلی
وەک شاهی سکـەندەر تـەڵەبی ئـابی بـەقاکـا» (١)

* * *

هیجرانـی، گـەلێ مـوهلیکە بـۆ بـەندە وەکـوو سـەم
هـەم سـینەیی سـوزانـە و هـەم دیـدەیە پـڕ نـەم
زووخاو و خـەمی دووری‌یـە، خـۆراکـمە هـەرژەم
«تاب و تەبی ئاتەشکەدەیی هـیجری وەکـوو شـەم
نـیزیکە مـنیش واریـدی سـەحرایـی فـەناکـا»

---

١ ـ مەبەستی ئەسکەندەری مەقدوونیە، کە رۆیشت بە دوای ئاوی بەقا واتا ئاوی حەیات.

تــــەنها ســـەفەرم رێگـــەیی ئـــەو شـــۆخەیە، رێـــمە
زنــجیری هــەوای ئــەشقی ئــەوە، دایــمە لە پێمە
بــەم حــاڵەوە پــێم ســەیرە یەکێ دیکـە لە جێمە
«لەم رێگــەیە تــەقدیری ئــەزەل وابــووکـە ئێمە
پــامالّی جــەفا بــین و رەقــیب ســەیر و ســەفاکـا»

* * *

حــەتتا بــە خــەویش دوورە لە مـن بچمە کـەناری
قــەلبی رەقــی وەک بــەردە، نــەرم نـابێ بە زاری
تـەخمیس و غـەزەل زەڕڕەیەکیش نـایە بەکـاری
«گیان و دڵ و دین، هەرسێ دەکەم بەزل و نیساری
بــێ کــامی دڵــی مــن بە لەبی لەعلی، رەواکـا»

* * *

ئــەشقی روحــی ئــەو یــارە مــنی کــردووە نـاتیق
چونکی کە «رەزا» شێخەو و هـەم شـاعیری حـازیق
«تاهیر» گەلێ پێ خۆشە قسـەی شـێخێکی سـادیق
«ســەر دانــێ لە رێــی ئــەشقی رەزا، لازمـە ئـاشیق
بــۆ یــاری ســـەر و مـاڵ سـوپەری تـیری قـەزاکـا»

* * *

غەزەلی ژمارە ـ ١ ـ «پیتی ـ تێ ـ»

نـەماوە شـاری بـابل [١]، چـاهی هـارووت [٢]
لەکوێ خوێندوویە ئەفسوون، چاوی جـادووت
دەڵـــێی تـــۆراوە قـــیبلەی ئـــاشقانت
کـە ئـەبرۆکـەچ بـووە مـیحرابـی ئەبرووت

---

١ ـ مێژوو نووسانێک وەکوو «دیاکۆنوف» لەکتێبی «مێژووی ماد». «مینورسکی» لە کتێبی «کورد». «ویل دۆرانت» لەکتێبی «مێژووی شارستانیەت»دا دەڵێن: شاری بابل یەکێ لەگەورەترین و پێشکەوتووترین شارەکانی دنیای قەدیم بووە کە ٢١ چەرخ لەمەوپێش یەکەم قانوونی جیهان «حەموورابی» لە ٢٨٥ مادە پێک هات، ئەم مێژوو نووسانە دەڵێن: شاری بابلی قەدیم شانی ئەدا لە ئێستای «پاریس» و ژنان وکچانی لە ئەدا و ئەتوار و ئەفسوونگەریدا بەناوبانگ بوون.

٢ ـ هارووت و marووت دوو مەلائیکە بوون کە خوا بۆ فێرکردنی سیحر و جادوو بۆ خەڵکی ناردبوو تاکوو موعحیزە و سیحر و جادوو لە یەک جودا بکەنەوە پاش جێبەجێ کردنی ئیشەکەیان لە خوا داوایان کرد سزای کارە خراپەکـەیان نـەخاتە قیامەت لەم دنیا سزایان بدات بۆیە خوا داواکارەکەیانی قبووڵ کرد و هاویشتیانیە نێو چاهی هارووت لە بابل، بۆیە چاهی هارووت مەشهوورە بۆ سیحر و جـادو کـە لە فۆلکلۆریشدا هاتووە و شاعیرانیش هێناویانە.

وەکـــوو مـــەرجـانی ئـاڵە ڕەنگـی ئـەشکم
لە تـاو ڕوخسـاری لەعل و لێوی یـاقووت (١)
مـــەکـــە مـــەنعم لە شـەهدی لێـوی ئـاڵت
دەزانـی خـۆکـە کـەس نـاژی بە بێ قـووت (٢)
عـــەجەب سـیـرێ لە ئـــەبرۆتا بـــەیانە
موخالیف پێکەوەن هەم تاق و هەم جـووت (٣)
وەرە «تـــاهیر» مـــەبەستە دڵ بـــە دونـیا (٤)
بـــە زاهـیر جـوان و، بـاتین پـیر و فـەرتووت

---

١ ـ لەعل: مەبەستی بەردی لەعلی بەدەخشانی ئەفغانستانەکە ڕەنگی وەکوو یاقووتە و لە دونیا بەناوبانگە، زۆربەی شاعیران بۆ تەشبیە هێناویانە.
٢ ـ قووت و خواردن ئەگەر لە کەس دریغ بکەن نامێنێ، واتە خواردنی من مژینی لێوی شیرینی تۆیە، لێم دریغ مەکە چوونکە ژینی من پێوەندی بە لێوی شەککەر باری تۆوە هەیە.
٣ ـ مەبەست برۆیەکە هەم دوودانەیە هەم بە وێنەی تاق و هیلالە، ئەمە لە شاکاری شاعیرانەی تاهیربەگە کە لە شیعرەکەیدا هێناویە، هـەم تـاقە و هـەم جـووتن واتـا دوودانەن. نالیی دەڵێ:
موژەت قوللابییە هەم تیر و هەم شیر　　　برۆت میحرابییە هەم تاق و هەم جووت
٤ ـ لێرەدا ئەوەی مامۆستا عەلادینی سـەجادی کـە لە مـێژووی ئـەدەبی کـوردی لاپەرەی ٤٧٤مان بۆ روون و ڕاست دەبێتەوە کە دەڵێ:
زۆر ئاشنا بووە بە خواردنەوە بۆ ئەوەی لە ئێش و ئازاری ژیانی بێ ئاگا بێ.

## غەزەلی ژمارە ـ ٢ ـ [١]

شەماڵ یار نەدیت، شەماڵ یار نەدیت؟ [٢]
وەختێ تۆ ئامای، دیدەی یار نەدیت؟
ئەو دیدەی سەیوان پڕ خومار نەدیت؟
ئەو توڕڕەی چین‌چین سیامار نەدیت؟
دڵدار دڵبەر، ستەمکار نەدیت؟
ئاهووی خوتەنی وەش رەفتار نەدیت؟ [٣]

---

١ ـ ئەم غەزەلە و دوو غەزەلی دیکەی تاهیربەگ بە شێوە زمانی هەورامی‌یە، وادیارە تاهیربەگ شێوە زمانی هەورامی چاک زانیوە.

٢ ـ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان شێوە زمانی هەورامی نە تەنیا زمانی شیعر بووە بەڵکوو زمانی رەسمی و نووسین و دەربار بووە، بەڵام نالی گۆرانی بەسەردا هێنا و مەحوی و سالم و هیندێتر لە شاعیران درێژەیان پێ‌دا. بە بروای من مەولەوی ئەم گۆرانکاریەی پێ ناخۆش بووە بۆیە هیچ پێوەندی و هاوکاری‌یەکی لەگەڵیاندا نەبوو،

٣ ـ ئاهووی خوتەن یان ئاسک: خوتەن بەشێکە لە چین جۆرە ئاسکێکی هەیە وە دووی دەکەون تاکوو هەڵبێ، هێندە راوی دەنێن تاکوو ئارەق لە لەشی دێتە خوار و لە ژێر ناووکیا ویشک دەبێتەوە و دادەکەوێ و مسکیشی پێی دەڵێن، بۆنێکی زۆر خۆشی هەیە و زۆر بەنرخە.

ئـەو پـەنجەی قـرمز، حـەنایی نەدیت؟ (١)
ئــەو نــوور دیــدەی، بـینایی نـەدیت؟
گـوڵڕووی گـوڵچیهرەی، گـوڵئەندام نەدیت؟
ســۆسەنی کــڵاف مـوشکینفام نـەدیت؟
لۆلۆی نــاسوفتەی هــیچئەڵماس نـەدیت؟
کــان یــاقووتی بــێقیاس نــەدیت؟
لیــمۆی نــەورەسەی مــەمانش نـەدیت؟
ئــەبرۆی سـەیفئاسای کـەمانش نـەدیت؟
ســینەی ســیمبەور پـەروەردش نـەدیت؟
خونچەی نەشکوفتەی بێگەردش نەدیت؟
بــاڵای عــەرعەری ســەروئاسا نـەدیت؟
شــۆخ دیــدەشەنگ بــێوەفا نــەدیت؟
شــاباز مــەریوان، هــەڵۆ خـو نـەدیت؟
نــازدار خــێڵان، فــیتنەجو نـەدیت؟ (٢)

---

١ ـ پەنجەی قرمز «سوور» یان حەنایی: مەبەستی ئەوەیەکە یارەکەی ئەمی کوشتووە و خوێنیشی لە سەر پەنجەکەیدا دیارە، جا بۆیە کاتێک ژنان حەنا «خەنە» لە پەنجەیان دەدەن ڕەنگی سوور یان ئاڵ بە خۆیەوە ئەگرێ و شاعیران بۆ شیرینکاری شیعریان بەکاری دێنن.

٢ ـ فیتنە جو یان ئاژاوەگێر. لێرەدا شاعیر تەشبیهێکی جوانی بەکار هێناوە گوایە

نــەدیت تــۆ بــەیۆ بــەعیشوە و نــازێ؟
بــــپەرسۆ ئــەحواڵ مــن لە رێــوازێ؟
تــەحقێق بــۆ شــەماڵ ئــەو شــۆخ و شــەنگە
نــەدیدەی شــاباز ئــەو دڵ چــون ســەنگە
هــیچ نــیەن وە تــەنگ مــەینەت بەردەکــەش
بــێ قــەیدەن نەحاڵ ســوختەی دەردەکــەش
یــاشا، هــەر یــارێ بــێ وەفــا و مــەیلەن
دەروون وە بــادەی بــێ مــەیلی کــەیلەن
دایــم گــرفتار ئــاهـ عــوشاق بــۆ
نــەسیبش دایــم تــاڵ فــیراق بــۆ
بــە وێــنەی «تــاهیر» هــەر دەردەدار بــۆ
دیــدەی مــەخموورش دایــم بــیمار بــۆ

* * *

---

فیتنەجو هەمیشە ئاژاوە ئەگێرێ و شەر هەڵئەگیرسێنێ. یانێ تۆش هیندە لەبەر دڵانی لە سەر تۆ شەر و ئاژاوەیە.

« پیتی - سین - » غەزەلی ژمارە - ١ -

سوور و سپی و ناسکە، وەک چووزەرەرێواس [١]
ئـاودار و تـەڕ و تـازەیە کـوڵمەی وەکـوو گـێلاس
ئـــەندامـــی لەتـــیفی، چ بـڵێم عـەینی بـلوورە
بۆی عەتری هـەناسە و مـەمکی کـەللە دەکـا کـاس
خـاڵی حـەبەشی، [٢] قـرچـە دەخـاتە دڵـی ئـاشق
شمشێری برۆی سینە دەکـا شـەق وەکـوو ئـەڵماس
حـەسرەت زەدەیـی ئـاشقی شـەیدایـە جـەماڵی
مـەحفووزی بکـەی رەبـبی «مـن‌الجـنة والنـاس»
لەو سـوورەتە مـەهـ پـەیکەرە، لەو سـەروە رەوانـە
لەو زولفە سیامارە کـە ئـەوگـەنجە دەکـا پـاس [٣]

---

١ - ئەم هەڵبەستە لە گۆڤاری سروەی ژمارە ٥٦ دەستمان کەوت، گۆڤاری سروەش لە نووسەری کوردستان کە لە بەیازێکدا چاپ بیوو دەتی کەوتووە.
٢ - خاڵی حەبەشی: وەکوو خاڵی ژنانی هیندوە. بەڵام ژنانی حەبەشی خاڵیان لەسەر لێویانە.
٣ - وا باوە کە دەسەڵاتدارانی پێشوو یان دەوڵەمەندان و تاجران لە سەر گەنجە کەی خۆیاندا مارێکی رەشیان دادەنا بۆ ئەوەی دوژمن و نامۆ نەتوانێ بەلای گەنجە کەیاندا بروا و دەستی بگاتێ.

موڵکی عەجەم و ڕۆمە بەهای بۆسەیی لێوی (۱)
دەیکەم بە فیدای یەک نیگەهی مامش و بڵباس (۲)
«تاهیر» سەری تەسلیمە لەبەر خاکی بەری پێت
دایناوە ئیتر حەیفە مەکە، بەسیە قسە و باس

* * *

۱ ـ عەجەم و ڕۆم: مەبەستی ئیمپراتووری ئێران و ڕۆمە کە چەند چەرخ پێش ئیسلام و پاش ئیسلام ڕۆمی ڕۆژهەڵات «شرقی» یان قوستەنتەنی‌یە ئیستامبولی پایتەختی تورکیە، گەورەترین وڵاتانی جیهان بوون و لە باری دەوڵەمەندیەوە لە دونیا بێ هاوتا بوون.

۲ ـ مامش و بڵباس: دوو عەشیرەن لە کوردستان. لە کاتی خۆیدا دەوڵەمەندترین عەشیرە بوون.

« پیتی ـ شین ـ »          غەزەلی ژمارە ـ ١ ـ

شـەهەنشای مـەئوای روح و دیـدە و هۆش
حـــوکمدار مـــڵک، دڵـەی پـڕ نـە جـۆش
دەلیـــــلەی رەمــــەی، ئـــاهوو رەفـــتاران
ســـەر دەســـتەی گـرۆی نـازک نـازداران
گوڵبۆی گـوڵرۆخسار، گـوڵبەرگ ئـەندامـە
گـــوڵخونچە لەبـــان، گـوڵین ژێـر جـامە
ســەرپەنجە گـوڵین، وە هــوون ئـەو دڵ (١)
وەهـــار ئـــاماوە، پـــەیدا بـی نـەو گـوڵ
حـــەیفەن وەی روخســـــار مـــینا کـــارەوە
وەی بـــاڵای نـــەوتوول وەش رەفـــتارەوە
وەی تـــورەی پـــێچ پێچ عـــەنبەر بـــێزەوە
وەی شـــیرین لەبـــان شـەککـەر رێـــزەوە

---

١ ـ مەبەستی رەنگی گوڵی سوورە، واتا سەرپەنجەکانت وەکوو گوڵی سوور رەنگین بووە، بەڵام بە «هوونی» خوێنی دڵی من.

ســـاتێ نـــەوینۆن نـــەو بـــاڵات چـــەمەن !
عـــەتر نـــە گـــێرۆن نـــە زوڵـــفت ســـەمەن! (۱)
نـــەرگس نـــەحەسرەت ئـــەو دیـــدە مەستە (۲)
چـــون مـــن مـــەبۆ شـــێت دێـــوانـــە و خـەستە
مـــەستانۆ خـــەراج زوڵـــفت نـــە ریـــحان
مـــەون بـــاج وە رووی گـــوڵنارت گـــوڵان
بـــزانـــە «تـــاهیر» بـــەستەی خـــاڵ تـــۆن
مـــەست نەبۆن وە دیـەن، دیـدەی کـاڵ تـۆن

* * *

---

۱ ـ مەبەستی گوڵی یاسەمەنە کە لە بۆن خۆشیا بەناوبانگە بۆیە فەرانسەویەکـان لەم گوڵە چاکترین عەتر و ئودکلۆن دەگرن و لە جیهانا بەناوبانگە.

۲ ـ لای شاعیران گوڵی نەرگس هێندە جوانە چاوی دڵدارەکەیان بە گوڵی نەرگس تەشبیە ئەکەن، لێرەدا تاهیربەگ زۆرتر رۆیشتووە دەڵێ: نەرگس پێی خۆشە وەکوو تۆ جوان بێ بەڵام وا نییە بۆیە دێوانە و خەستە حاڵە وەکوو من شێت بووە چوونکو لە جوان چاکیا ناگا بە تۆ.

« پیتی - میم - » غەزەلی ژمارە -١-

یـــــاران فـــەرهادم، یـــاران فـــەرهادم
جــــــانشین خـــاس قـــەوم فـــەرهادم
ئـــەورۆکـــە فـــەرهاد پـــۆشان وەکـــەفەن
ئـــەرواش کـــەرد فـــیدای شـــیرین ئـــەرمەن
پەرسا یەک یەک نام، دەروون پڕ دەردان
بـــە حـــاڵ ئـــەحواڵ هـــەناسە ســـەردان
قـەیس و وەیس و مـن وە تـاقیق خـەمبار (١)
یـەکســەر تـەعداد کـەرد، ئـەو روزشـمار
وات کـێ بـۆ لایـەق پـەی مـەقام مـن ؟
گـــوم نـەبۆ تـا حـەشر سـەودای نـام من
مـــن کـــەرد گـــوزیدە پـەی وارس وێش
ســـپەردش وە مـــن کـالاّی ئـێش و نـێش

١ - دەڵێ ئەو هەموو ئاشقانەی کۆکردەوە و هێنای لای مـندا دایـنا و تـەنیا مـنی هەڵبژارد چوونکو من لیاقەتی جێنشینی فەرهادم هەبوو هەتا کوو رۆژی مەحشەر ناوم ون نەبێ و درێژەدەری رێگای بم.

شـــێتی و مــەدهۆشی، وێــڵ ســەر کــێوان
عــــــەزاب دووری دەرد بـــێ دەرمـــان
بـێ خـورد و خــاو بــی سەودای ئیشتیاق
ئــــاگـــر هـــیجران زووخــــاو فــیراق
نـــویسا، نـــە دەفـــتەر وە هــوون زامــان
یەک یەک پەرێ من هـەرچـی پێش ئامان
وات، یـــە سـەرمەشقەن پـەی تــۆ بـزانــی
ئـــیسمت مـــەشهوور بـۆ فـەرهاد سـانی
یـــاران فـــەرهاد مـــەرد، وە نـا کـامەوە
پــــەرێ ئــــاخ و داخ، مـــن هــەر مـامەوە
شەرت بـۆ چـون فەرهاد، چینیی دەروەدەر
وێــــم کـەم بـە سـەرگەرد خــالاّن دڵــبەر
بـەڵ وێــنەی فـەرهاد دێـوانەی خـودسەر
نەجات بۆم جە دەست چەرخ بەد ئەختەر
یــە «تــاهیر» واتـەن دەروون پڕ جە خەم
زامش جـــە زامــــی فـــەرهاد نـیەن کـەم

* * *

## غەزەلی ژمارە ـ ٢ ـ

مەلجەئو پشت و پەناهێ غەیری لوتفی تۆ نیە (١)
گەر ببەخشی وەر نەبەخشی، جان نیسار و چاکەرم
تالیبی دیبای شەفاعەت، کەس نیە وەک من بەجان
بۆ مەتاعی رەحمەتی تۆ، ئیمرۆ ئەمن سەوداگەرم
نابێ من تەنها لە لوتفت بێنەسیب و بەهرە بم
چونکە فەرمووتە، شەفیع و شەهسواری مەحشەرم
نەعتی شاهی ئەنبیا «تاهیر» کە هاتە سەر زبان (٢)
جیلوە بەخشی زەوقە ئیمرۆ نەزمەکەی پڕشەککەرم

* * *

---

١ ـ پێم وایە ئەم هەڵبەستە یەک یا چەند بەیتێکی لە ئەووەڵەوە نەمابێ.
٢ ـ لە نەعت و پێداهەڵچوندا تاهیربەگ کەمهاوتا بووە چوونکوو تاهیربەگ ئەشق و ئەوینێکی راستەقینە لە دەروونیدا هەبووە، جا بۆیە ئەوینی پاک شتی پاکی لێ دەبێتەوە، نەعت و پێداهەڵچونیش لە دەروونی پاکدا دێتەدەر و دەنووسێ بەدڵیشەوە.

## غەزەلی ژمارە ـ ٣ـ

هەرچەندە دەمێکە لە خەما غەرقەیی خوونم
هەرلەحزە لە دەس جەوری فەلەک مات وزەبوونم
بەسراوە بە زەنجیری ئەلەم گەردنی شەوقم
مەشهوورە لە ناو ئەهلی جیهان، شۆری جنوونم
ئەلفی قەدەکەم راست، وەکوو تیری خەدەنگ بوو
وا خەم بووە ئیستاکە، ئەڵێی، حەڵقەیی نوونم
مەعشووقەکەوا موونیسی رۆژ، هەمدەمی شەو بوو
وەک ئاهویی رەمکەردە، لە دەس بەختی نگوونم
دڵ مڵکی عەجەم، عەسکەری خەم، لەشکری سالار (١)
وێرانی ئەکا ئاخری، بێ سوودە فسوونم
مەرهەم، کە شەفا بەخشی برینە بە حەقیقەت
وەک داخی لەسەر داخە، لە بۆ داخی دەروونم

١ ـ مڵکی عەجەم: مەبەستی ئێرانی چەند سەد ساڵ لەمەوپێشە کە زۆر گەورە و پان وبەرین بوو، بەڵام لە ئەووەڵی حکوومەتی سەفەوی بەتایبەت شائیسماعیل لە شەڕی چاڵدران و پاشان حکومەتی قاجارەکان بە تەواوی لەت لەت کراو و بچووک بووەوە.

چـــونکوو هـــەموو شـــێواوە جـــیهان تـــەرز و ڕەوشتی
یـــەکســـانە لە لام شـــادی و خـــەم، بـــوون و نـــەبوونم
سەد شوکری خوا، مەرکەزی سەد میحنەت و دەردم (١)
وا تـــێمەگـــە لەم دائـــیرەیی چـــەرخـــە بـــیروونم
«تـــاهیر» وەکـــوو مـــەجنوون لە خـــەیاڵی ڕوخـــی لەیلا
دێـــوانـــە، لە ســـەحراو و ســـەراســـیمە لە تـــوونم (٢)

* * *

١ ـ مەرکەز: ناوەند، یانێ هەموو دەرد و میحنەت لە نێو دڵی مندایە.

٢ ـ بەراستی تاهیربەگ لە شیعری دڵداریدا سەری لە عەرش دراوە ئەگەر هەموو شیعرە ون بووەکانی دەسمان کەوێ و لە چاپی بدەین ئەدەبی کوردی لە شیعری دڵداریدا کەم هاوتا دەبێ.

« پیتی ـ نوون ـ » غەزەلی ژمارە ـ ۱ ـ (۱)

مەتلەعی سوبحی سەعادەت مەزهەری «عیلمالیقین» (۲)
ئـــەی ســـپەهسالاری فـــەوجی ئـــەنبیائو مـــورسەلین (۳)
بۆ نەوازش، زاتی حەق هەم حوججەت و هەم دەنگی تۆ
شـــاهیدی تـــەعزیمی تـــۆ بـــوو یـــاوەری رۆحـــولئەمین

---

۱ ـ ئەم شیعرە زۆربەی هەرە زۆری عەرەبیە بەلاّم تەواناییِ شاعیر کوردانەوویەتی و هەست ناکەی وشەیەکیش عەرەبی تێدابی. هەروەها لە زۆربەی تەکیە و خانەقاکانی کوردستان دەخوێندریّ.

۲ ـ بەرێز کاکەی فەللاح لە دیوانی ناری کە لە ساڵی ۱۹۸۴ی زایینی لەچاپ دراوە ئەم شێعرە بە هی ناری دەزانیّ بەلاّم ئێمە لە پەراوێزی پێنج خشتەکیەکەی‌دا باسمان کردووە و وتوومانە هی تاهیربەگە نەک ناری، هەروەها مامۆستا عەلادینی سەجادیش لە مێژووی ئەدەبی کوردی لاپەرەی ٤٨٢ دا هێناویە و بە هی تاهیربەگی دەزانیّ، لەم شیعرەدا هیچ ناویّ لە ناری‌یەوە نی‌یە و بەڵگەیەکی ئەوتۆمان وەدەست نەکەوت جا کاکەی فەلاح لێرەدا شارەزاترە بەلاّم ئێمەی قانع نەکرد، ناری تەخمیسێکی لە سەر ئەم شیعرە داوە من پێم وایە ئەگەر هی ناری بایە تاهیربەگ تەخمیسی ئەکرد، بەلاّم پێچەوانە.

۳ ـ هەرچەند ئەم شیعرە زۆربەی هەرە زۆری عەرەبی‌یە بەلاّم توانایی شاعیر روحی کوردی پیّ داوە، واتا کوردانەویەتی.

مــوشکی تــۆزی دامــەنت، عــەتری دەمــاغی ئــەتقیا
یەعنی بۆ تەئسیری بینش، عینی سورمەی خـاکـیین (١)
روو لە کێ کەم غەیری تۆ ئەی شـافیعی زومـرەی ئـەسیم
مــــن گــونەهبار و خــەجاڵەت، تــۆ شــەفیعولموزنیبین
خۆم لە قـورِ بگـرم بـەجارێ هـەر لە پـێ تـا تـەوقی سـەر
بەڵکوو لوتفی شاهی لەولاک بێ نـەجاتم دا لە شـین (٢)
مــوستەحەققی تــیر و تــانەی ئـاشنا و بـێگانە خــۆم
واجـــبی رەحــــم بــــەسە یــــارەحمەتەن لیــلعالەمین
رووت و قووتی مەحشەر و بێ سایەو و ئـاوارەخـۆم (٣)
مــەزرەعەی عــەفوی خـودا نـابێ بـبێ، بـێ خـۆشەچین

---

١ ـ مەبەستی تووری سینایە کە بە داخوازی حەزرەتی مووسا «د ـ خ» خوای گەورە لە سەر کێوی سینا بەشێ لە نووری خۆی پیشان دا بەڵام نووری خواکێوی سووتاند و بووبە سورمەی چاوان. پێشتر حاجیان کە لە زیارەتی خودا ئـەهاتنەوە بـۆ دیـاری سورمەیان ئەهێنا و ژنان و پیاوان بەوپەری خوشحاڵیەوە کەڵکیان لێی وەر ئەگرت و زۆر بۆ چاو قازانجی هەبوو، بەڵام ئێستا بە جۆرەها دەرمانی کیمیاوی جێی سورمەی گرتوتەوە کە بۆ چاوی ئافرەت زەرەری زۆرە.

٢ ـ لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتیدا وا باوە هەرکەس شتێکی ویست بە قور پێوان و گریان و شینەوە داوای کردووە بۆ ئەوەی سرنجی بەرانبەر بۆ لای خۆی رابکێشێ.

٣ ـ مامۆستا سەجادی وای نووسیوە: ئیستە من قانع بە خوشەی ئایەتی لا«تقنطوا»م.

حەسرەتا مەحرومی شەهد و زیارەتی شوبباکی تۆم
بۆ نەڕێژم ئەشکی ئاڵ و ئاوی گەرم و ئاتەشین
ئەی حەبیبی خالیقی عالەم تەرەحوم تا زووە
ئەو سەگی ئەسحابی کەهف و من سەگێکی تابیعین (١)
روو لەقاپی موستەفا کە بێژە یاخەیرولبەشەر
نیمە تۆشەی رێگە، جوز ئیخلاسی ئالی «تاهیر»ین (٢)

* * *

---

١ - شێخ رەزای تاڵەبانی دەڵێ:
یارسول‌الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف
داخل جنّت شوم در زمرهٔ اصحاب تو
او رود در جنّت و من در جهنم کی رواست
او سگ اصحاب کهف و من سگ درگاه تو

٢ - شاعیرانی کلاسیک بۆ ئەوەی شیعرەکەیان وون نەبێ لە بەیتی ئاخری شیعرەکەیاندا ناوی خۆیان ئەبەن لێرە تاهیربەگ شیرینکاری کردووە بە جیناسەوە هەم ناوی خۆی بردووە هەم ئالی«تاهیرین»ی هێناوە.

## غەزەلی ژمارە ـ ٢ ـ

نموونەی روویی تۆیە ماهی تابان
نەزیری موویی تۆیە رەنگی قەتران
لە شەکرباری لێوت بێ نەسیب بووم
بەڵێ، هەر تەنگ رۆزین ئەهلی عیرفان
بە ماچێکی دەبەخشم گەر کەرەم کات
جەمیعی خەرج و دەخڵی موڵکی بابان (١)
برۆ و روخسار و زوڵف و لێوی ئاڵت
شەو و رۆژ و هیلال و عیقد و مەرجان (٢)

---

١ ـ حافزی شیرازی دەڵێ :

اگر آن ترک شیرازی بدست آرد دل ما را        به خال هندوش بخشم سمرقند و بخارا را.

تەیموورە شەل «تیمورلنگ» حافیزی شیرازی هێناوە و لێی توورە بووە وتوویە چلۆن سەمەرقەند و بوخارا کە من ئەو هەموو زەحمەتەم لە گەڵیان کێشاوە و چەندین ساڵە ئاوەدانی دەکەمەوە ئێستا دوو شاری گەورەو پربایەخی جیهانە تۆ بە ئاسانی دەیبەخشی بەخاڵی لێوی یارەکەت؟ حافیزیش لە وڵاما دەڵێ: قوربان ئەو هەڵەخەرجیانەم کرد بۆیە هیچ لە دونیادا شک نابەم و بێ ماڵ و حاڵم.

٢ ـ برۆ: شەو. روخسار: شەو. زولف: هیلال. لێوی ئاڵی بە مەرجان شوبهاندووە.

بـــیحمیدللە ئـــەتۆی ئـــەمڕۆ بـە خـووبی
لە جێی فـەرزەندی خـاسی پیری کـەنعان (١)
نـە مـن مـاچی لەبـی تۆم بـوو بە قسمەت
نـە ئـەسکەندەرگـەیشتە ئـاوی حـەیوان (٢)

---

١ ـ مەبەستی حـەزرەتی «یـۆسف»ە کـە بـاوکی «حـەزرەتی یـەعقوب» هـەمیشە ئارەزووی دیتنی بوو.

٢ ـ ئەسکەندەری مەقدوونی کوری «فیلیپ» یان بە وتەی خـەڵکی ئـاتێنی یـۆنان «فیلیپووس» یان بە وتەی کورد و عەرەب «فەیلەقووس»ە کە لە چەرخی ٤ی پـێش زایین لە مەقدوونیەی یۆنان هێرشی کردە سەر «ئاسیا»و حکوومەتی هەخامەنیشی لە ئێرانی رووخاند و تەختی جەمشێدی وێران کرد. ناوی فەیلەقووس زۆرتر بۆ خەڵکی مەریوان و سنە و دەوروبەر ئاشنایە گوایە فەیلەقووس پادشا یان فەرماندەیێکی زاڵم بووە و زۆر زڵمی لە خەڵک کردووە، دەروێشێک کە ئێستاش قەبرەکەی لە تەنیشت زرێوارە یەکێ لەوانە بووە کە خۆی و ژنەکەی زۆر زڵمیان لێی کراوە، دۆعای کردوە شار ببێتە دەریا. دۆعاکەی قبووڵ کراوە. من پێم وایە ئەوکەسە نوێنەری ئەسکەندەر و لەشکری یۆنان بووە و فەرماندەکەشی یۆنانی بـووە. وا بـاوە دەڵـێن ئـەسکەندەر بۆئەوەی قەت نەمرێ دەگەرا بە شوێن ئاوی حەیوانا واتا «آب حیات» بۆ ئـەوەی هەرگیز نەمرێ، بەڵام دەستی نەکەوت. شاعیر لێرەدا دەڵێ: ئەگەر منیش ماچی لێوی تۆم دەست بکەوتایە هەرگیز نەدەمردم، دیارە لێرە شاعیر ماچی لێوی یار بە مەحاڵ دەزانێ، وەکوو ئەسکەندەر ئەمیش بە ئارەزووی ناگا.

بــە زاهــیر کــەم دەبـەم ئـیسمی ویسـالت
لە خــۆفی حــاسید و بـیمی رەقـیبان (١)
حیکایەت بـوو لە تـوولی زولفت ئـیمشەو (٢)
هــەتا جــەمعی رەفـیقان بـوون پـەرێشان
وەرە تــەسلیم کــە رۆحت بـا خـەلاس بـی
ئـەتۆش «تـاهیر» وەکـوو جـەمعی رەفـیقان

* * *

١ ـ هیندێ جێگا تەعنی، نووسراوە. واتا ناوێرم لەملا و ئەولا ناوت بەرێم چونکوو لە نەیاران ئەترسێم و رەقیبە کانیشم پێیان ناخۆشە بەلاّم لە دلّەوە ئەبەم و زیکرت ئە کەم.

٢ ـ مەبەستی درێژایی شەوانی پاییزە کە لە مالاّن دادەنیشتن و حیکایەتیان دە کرد و هەروەها شەو رەنگی رەشە بۆیە زولفی لە درێژایی و رەشـی تـەشبیە کـردووە بـە حکایەتی شەوان.

## وا باوە تاهیربەگ و «ناری» ئەم غەزەلەیان پێکەوە داناوە [1]

### غەزەلی ژمارە -٣-

به خەمزەی چاوی مەخمووری سیاهی، مەستی مەی کردین
بە ماچی لێوی موستەغنی لە ئەنواعی مەزەی کردین
ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵناری بەئاهی من
کە چی دەستی لەسەر دانا، لە سەیری باخی بەی کردین

---

١ - «بەرێز کاکەی فەللاح لە دیوانی ناری چاپی ١٩٨٤ی زایینی دەڵێ: «ناری» وتوویەتی بە ناحەق ئەم غەزەلەیان کردوە بە دانانی من و تایەربەگ، راستیە کەی ئەوەیە هەمووی هی خۆمە ... بەڵێ هەروایشە چونکە دارشتنەکەی لە هی یەک شاعیر ئەچێ. ئەم راستی‌یە لە حاجی مەلائەحمەدی قازی بیستراوە» .

ئێمە هاتینە سەر ئەم راستیەیەکە ئەم شیعرە هی تاهیربەگە، چونکوو ناری لە دانانی ئەم جۆرە شیعرانە خۆی پاراستوە. بەوتەی کاکەی فەللاح لە هی یەک شاعیر ئەچێ ئەویش تاهیربەگە نەک ناری. ئەم جۆرە شیعرانە دوورە لە شاعیرێک کە لە نێو مەکتەبی تەسەوف و عیرفاندا ژیاوە. مەعلوومە شاعیرێک وەکوو تاهیربەگی شیرین کەلام و ئەویندار و دڵتەر ئەبێ خاوەن ئەم شیعرە بێ، هەروەها بەیتی ئاخری شیعرەکەی کە دەڵێ عەلاجی دەردی دڵ «ناری» لە «تاهیربەگ» تەمەنناکە مەعلوومە ... ح-گ

به هەوری پەرچەم و زولفی، روخ و ئەبرۆی کە داپۆشی
لە شەوقی روئیەتی بەدر و هیلالی یەکشەوەی کردین
ئەگەرچی کوشتنی خۆ، «قابیض‌الارواح»ی موژگانی
بە قانوونی مەسیحایی، [1] بە خەندەی لێوی حەی کردین
عیلاجی دەردی دڵ «ناری» لە «تاهیربەگ» تەمەنناکە [2]
بلێ ئەمرۆ گوڵەندامێ، بە تیرێ جەرگی پەی کردین

* * *

---

١ - هەر پیغەمبەرێک بۆ خۆی ئیعجازێکی هەبوو. قانوونی مەسێحایی: ئیعجازی حەزرەتی عیسا «د ـ خ» زیندوو کردنەوەی مردوو بە ئەمری خودا بە دەستی حەزرەتی عیسا «د خ» بوو، شاعێر لێرە خەندەی لێوی یاری هێندە لای خۆشە کە پێی زیندوو دەبێتەوە.

٢ - لێرەدا هۆنەری شیعر لە ناری داوای عیلاجی دەرد دەکا جا ئەگەر ئەم شیعرە هی ناری بایە لە تاهیربەگ تەمەننای عیلاجی دەردی دەکرد، بۆیە ئێمە پێمان وایە ئەم شیعرە هی تاهیربەگە نەک ناری، جگە لەوە سەبکی شیعری ناری و تاهیربەگ بە ئاسانی دەتوانرێ جیابێتەوە.

«پیتی - هێ -» غەزەلی ژمارە -١-

فــەسڵی خــەزانــی هــیجرە، رەســمی زەمــانی دوونــە
دەردی فــیراقــی یــاران، تــەقدیری کــاف و نــوونە
دونــیایە رەســمی وایــە، بــەزمی وەکــوو بــەڵایە
عــەیشی هــەموو جــەفایە، بــادە بــە رەنگــی خــوونە
گــوڵە رەفــیقی خــارە، شــەرابــە پــڕ خــومارە (١)
گــەنجە ئــەنیسی مــارە، بــەو بــۆنەوە بــە بــوونە (٢)
بــێزارە تــەن لە هــیجران، چــاویش پــڕە لە گــریان
چ بکــەم عــەلاجی قــوربان؟ دڵ عــاجز و زەبــوونە

١ - لێرە تاهیربەگ زەممی شەراب دەکا، دەڵێ مرۆڤ ئەگەر بیەوێ خۆش بێ دەبێ لە مەجبوری شەراب بخواتەوە، دەڵێ ئەگەر بیەوێ گوڵ بەدەستەوە بگرێ دەبێ هاوڕێیی درکیش بکات.

٢ - وا باوە بووە زەمانی زوو لە سەر گەنجەوە مارێکیان دائەنا بۆ ئەوەی پاسەوانی لێ بکات و نەیاران دەستیان پێی نەگا لێرەدا شاعیر دەڵێ: مار ئەوندە بایەخی نییە چونکوو کردویانە بە پاسەوانی گەنج نرخی پێی دراوە. سەعدی شیرازیش دەڵێ: گوڵدان بۆیە بەنرخ بووە چونکوو گوڵی تێدا دەروێ و بۆنی گوڵ دەگرێ ئەگینا قوڕێکی بێبایەخە.

مەیلی فیراقی «ناری» دونیا وەهایە کاری (١)
ئەم چەرخە پڕ لە شوورە، ئەرکانی واژگوونە
شیرینە وەسڵی یاران، چونکە دەگاتە هیجران (٢)
نازانی رۆحم ئەمما، چەند تاڵ و ترش وتوونە (٣)
لە ژێر خەما مەوێستە، فەرموو دەستت بهێنە
خەزمانی شادمانە «تاهیر» مات و زەبوونە

* * *

١ - تاهیربەگ ئەم هەڵبەستەی بۆ ناری ناردووە و تێدا بێ ئارامی خۆی لە دووری ناری دەربریوە، تاهیربەگ شیعر و نامەی زۆری بۆ ناری ناردووە، دوور نیە ئەو چەند پارچە شیعرەکە کاکەی فەللاح بە هی ناری دەزانێ لە نێو دەست نووسەکانی ناریدا دۆزرابێتەوە کە بە هەڵە بە ناو ناری چاپ کراوە.

٢ - یار هەتا دوورتر بێ شیرینترە، ئەم ووتەیە لەباری کۆمەڵ ناسی و دەروون ناسی یەوە دروستە.

٣ - جوانترین تەشبیە بۆ ناخۆشی ئەوەیە، کە نەخۆش دوچاری ئەو سێ مەززە واتە «تاڵ و ترش و توون» بێت لێرەدا تاهیربەگ ئەوپەری لێزانی خۆی پیشان داوە.

## غەزەلی ژمارە -٢-

رۆژی تـەرەب و فـەسڵی گـوڵ و وەخـتی بەهارە
یـاران گـوڵەکەم، کـواکـە دەمـی بۆس و کـەنارە
گوڵزاری ئـیرەم سـوورەتی زیبای قـەدی تـۆیە (١)
گـۆشەی چـەمەن و رویـی گـوڵ و پـایی چنارە

---

١ - باخی ئیرەم یان بوستانی ئیرەم: بەناوبانگە، لە قورئانی پیرۆزیشدا باسی کراوە لە ئایەتی «اِرَمَ ذاتِ العِماد، الَّتيلم یُخْلَقْ مِثْلها في الْبلادِ» باسی لێ کردووە وگوایە شەداد پادشاهێکی زاڵم و دەست‌روو دروستی کردوە بۆ عەیش و نۆش و خۆش رابواردنی خۆی بەڵام پێش ئەوەی شەداد بڕواتە نـێوی خـوای گـەورە گـیانی لێ ئـەستێنێ و بەهەشتەکەی دەکاتە هەموان و مەحوی دەکاتەوە گوایە بەشی بەهەشتی خوایی‌یە، زانایان دەڵێن ئەو بەهەشتە هەموو میوەیێکی تێدا هەبوو و لە جوانترین ژن رازابوەوە.

هەروەها چەندین باخ و سەیرانگا لە ئێراندا بەمناوە ناونراوە. نالی دەڵێ:

بـــیحەمدیللا دوو چــاوی یــارم ئــۆخەی
بــە بـێ مـەی مـەستە، بـێ مـەی مـەستە بـێ مـەی.
لە بـــوستانی «ئـــیرەم»دا قـــەت نــیيە وەک
شـــەمامەی وەک شـــەمامەی وەک شـــەمامەی

وەفایی مەهابادیش دەڵێ:

ئـەی نـەسیمێکی گـوڵی زار و شـوعاعێکی روخت
شەوقی رۆژ و بەدری تابان عەتری گوڵزاری ئـیرەم

بــنوارە لە بــۆ حــەڵقەیی زولفت لە ســەری کــوڵمە
درەفشـــی درەخشـــانیە، نـــیوەشەوی تـــارە (١)
بەو زولف و موژەت مەمکووژە هەردەم بە جەفایێ
جــارێ لە تــەنافم مــەدە، سەد جــار لە قەنارە (٢)
تــیری مــوژەکــەت قــاتڵە هــەردەم بــە بــەلاَیێ
دایـــم لە دڵـــی خـــەستەدڵان پــێکی، چــومارە
ســـووتاو و بـــریندارم و ســـەودایــی و مــەستم
بەو پەرچــەم و ئــەگــریجەو و بەو چــاوە خــومارە
ئــەو خــاڵە لە ســەر لێــوتە جــانا، چــی‌یە فــەرموو!
جــێ مــاچی لەبــی «تــاهیر»ە نــیشانەیی پــارە (٣)

---

١ ـ درەفش: ئالاَ، جەنگاوەرانی قەدیم کاتێ ئەرویشتن بۆ شەر و سەربازان لە سەر شانیان دادەنا و ئەرژایە سەری کۆڵیان، بەتایبەت لەکاتی نیوەشەواندا هێرشیان دەبردە سەر دوژمن و دەشەکایەوە و دڵی دوژمنی دەلەرزاند.
٢ ـ تەناف و سێدارە لەگەڵ قەنارە فەرقی هەیە، تەناف حەڵقەیەکە ملی تاوانباری پێوە ئەکەن، بەلاَم قەنارە ئەو چەنگەکەیە وەکوو قولابی ماسی‌کە قەساب گۆشتی پێوە ئەکەن. شەهیدی نەمر و هاورێکانی خوالێ خۆشبوو شێخ سەعیدی پیران لە لایەن کەمال مستەفای تاونبارەوە بە قەنارە شەهید کران، شەو و رۆژێک بەسەر قەنارەوە بوون پاشان گیانی پاکیان فیدای سەربەرزی کورد و کوردستان کرد.
٣ ـ مەبەستی شاعیر ئەوەیە کە هیندە توند پار «پارەکە» ماچم کردی و جێگاکەی

## غەزەلی ژمارە ـ٣ـ

دڵ نەخۆشی دەردی هیجرە، جانی جانانم وەرە (١)
لەت لەتە جەرگ و هەناوم، ماهی تابانم وەرە
عیللەتی دەرد و شەفاکەم وا بە لێوی شەککەرت
مایەیی ژین و حەیاتم، دەرد و دەرمانم وەرە
سەد شوکر دوبارە جەژنە، وەختی عەیش و شادیە
بۆ بەلاگەردانی بالات، قۆچی قوربانم وەرە
دڵبەرەی قەدعەرعەرەی بێ ڕەحمەکەی بەدبەختەکەم
دڵ ڕفێنەی شۆخەکەی بێ عەهد و پەیمانم وەرە
نازەنینەی سوخمە ئاڵەی دیدەمەستەی کەچ کولاە (٢)
گوڵعوزارەی شۆخ و شەنگەی شاهی خوبانم وەرە

---

ڕەش بوەتەوە ئەمساڵیش جێگاکەی دیارە و بووەتە نیشانە.

١ ـ سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی ئەم شیعرەی کردوە بە گۆرانی.

٢ ـ کلاّو لار یان کەچ کولاە، زۆرتر کچان بۆ سەرنج ڕاکشانی کور کلاّوەکەیان لار لە سەریان دادەنا. ئەم مۆدەش لە چەرخی نۆزدەهەمدا لە پاریس و لەندەن باو بوو، ژنی ناپیلۆنی سێهەم ئیمپراتوری فەرانسە ئەم مۆدەی لە پاریس ڕەواج دابوو کچانیش لاسایان دەکردەوە و زۆریش لێیان دەهات. لە کوردستانیش کچی گەورە ماڵان لە سەر جلوبەرگی کوردی کلاّوێکی جوانیان لەسەر ئەناکە پێیان ئەگوت کلاّو زەر.

خـانە وێـرانـم لە دووریت، ڕەهـزەنی ئـیمان و دڵ
زیـنەتی بـەزم و سـروورم، شـەمعی دیـوانـم وەرە
چونکە سایەی چەتری زولفت دوور لەفەرقی فەرقمە
سـینە پـڕخوێن و زووخـاوم، دڵ پـەرێشانم وەرە
دوور لە بـاڵای نـەونەمامت زامـی جـەرگم تـازەیە
وەک عەرەب سەدجار دەخیلەک، زوو بە لوقـمانم وەرە (١)
کـەس نـیە سـابت قـەدەم وەک مـن لە داوی ئـەشقدا
بـۆ سـوپاهی غـەمزەکـانت مـەردی مـەیدانـم وەرە
گـەر دەپـرسی حـاڵەتی مـن بـۆ فـیراقت پـێت بڵێم؟
هـەر وەکـوو «تـاهیر» هـەمیشە دیـدەگـریانم وەرە

* * *

١ ـ ئامان و دەخیلی عەرەب زۆر مەشهوورە، کاتێ دەپارێنەوە دڵی خەڵکی دەکەن بەکەباب، لەکاتی ڕاپەرینی ١٩٩١ی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عیراق بۆ بەعسی کوشتن و تۆڵە سەندن، خەڵک قۆڵی هەڵماڵیبوو بەڵام بە «دەخیلەک» وەها دەپارانەوە کە خەڵکی رابردووی لەبیر دەچووەوە و دەیانبەخشین، لە شەری عیراق و ئێرانیش دیلەکان زۆریان بە «دەخیلەک» خۆیان رزگار و دەرباز دەکرد و ئێرانییەکان وازیان لێدەهێنان و دەیانبەخشین، بەڵام لەکاتی دەسەڵاتداریدا جۆرێترن، بێ ڕەحم و...

## غەزەلی ژمارە ـ ٤ ـ

دڵ لە هیجرت وا لە خەمدا ماهی کەنعانم وەرە [١]
زەخمە جەرگم بۆ فیراقت زوو بە لوقمانم وەرە
سەد تەبیب هات و عەلاجی ئەم برینانەی نەکرد
تۆ عەلاجی زەخمەکەم کە، سا بە ئامانم وەرە [٢]
گەر دەزانی چەن پەشێوە حاڵەکەم بۆ دیدەنت
سەد ئەوەندەی زولفەکانت دڵ پەرێشانم وەرە
لوتف و تانەی تۆ لە لای من هەردوو یەک رەحمەتە
کەعبەکەچ نابێ، لەبەر لۆمەی رەقیبانم وەرە
هەرکەسێ هات و بە تیری غەمزەکەت سەد پارە بوو
کەس نیە وەک من حەریفت، مەردی مەیدانم وەرە
کافرا دەردی فیراقت وا لە جەرگم کاریە
سا بکە رەحمێ بە حاڵم، ماهی تابانم وەرە

١ ـ ماه: مانگ. ماهی کەنعان مەبەستی حەزرەتی یوسفە.
٢ ـ هونەرمەند سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی زۆربەی شیعرەکانی تاهیربەگی کردووە بە گۆرانی. ئەم شیعرەیش یەکێ لەوانەیە.

سەد کەڕەت ئیمڕۆ لە دووریت خوێن لە چاوم جاریە
غەرقی دەریای ئەشکی خوێنم، شەمسی خوبانم وەرە
گا دەگریێم گا دەسووتێم کار و بارم زاریە (١)
زیوەری تاجی غەریبم، شاهی خووبانم وەرە
سینە نالاّن هەروەکوو بولبول لە دووری گوڵشەنت
سا بەلوتفێ بمدوێنە، جانی جانانم وەرە
بەس جەفا بنوێنە قوربان زوڵمی ناحەق چا نیە
کافریش رەحمێ بەسە، دەی، دین و ئیمانم وەرە
سوورەتی بالاّت بەدایم نەقشی قەلبی زارمە
هەر وەکوو مەجنوون لە ئەشقت دیدە گریانم وەرە
دیدە مەستی شۆخ و شەنگی نازەنینەی شارەزوور
دڵ ڕفێنی جەمعی عالەم، کەبکی کوهانم وەرە (٢)
دڵ لە دووریت پڕ لە خوێنە شەمعی دیوانی ئەمن
هەروەکوو «تاهیر» هەمیشە سینە بریانم وەرە

---

١ - وەفایی مەهابادی دەڵێ:
گا دەگریێم گا دەسووتێم غەرقی ئاو و ئاورم
ئاخ لەبەر بەختی سیا نازانم ئەز بۆچ نامرم
٢ - مەبەستی کەوی کێوی یە.

## غەزەلی ژمارە -٥-

تا بەکەی قوربان بنالّم من بە ئێش و دەردەوە (١)
دەس بە ئەژنۆ قوڕ بەسەر دایم بە ئاهی سەردەوە
رۆژی ئەووەڵ بوو کە زانیم من ئەبێ دێوانە بم
ئاشقی تۆ، نەوعی مەجنوون، وا بە کێو و هەردەوە
مەرحەمەت کە زوو بڕۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم
نازی پاپۆچت ئەکێشم من بە تۆز و گەردەوە

---

١ - ئەم هەڵبەستە لەگەڵ شیعرێکی «مصباح الدیوانی ئەدەب»دا بەناوی:

دڵ لە حەسرەت غەمزەکەی دوونەرگسی پرخەوتەوە
وەک خەمی زولفت عەزیزم چوو بە رووتاکەوتەوە
مەنعی سووتانم ئەکەن ئەمرۆ لە شەوقی روومەتی
چۆن نەسووتێم من بە ئاگر ئەو بە بارێ نەوتەوە

بە هەڵە چاپ کرابوو کە لەم دیوانە دەرمان هێنا، مەعلوم نییە چلۆن هاتوتە ناو دیوانی تاهیربەگەوە. هەم سەبکی شیعرەکە دیارە هی کێیە هەم قافیە و وەزنیش یەک ناگرنەوە مەلا رەسوولی ئەدیبیش تەخمیسێکی لە سەری داوە و شیعرەکەی میسباحی ئەدەبی تەخمیس نەکردووە و دەرهێناوە، ئەم هەڵە دەیان ساڵە ساخ نەکراوەتەوە و بە ناوی تاهیربەگەوە خوێندراوە.

مـــن کــە پشــتوانــی بــاڵاو و بــۆسەچینی کــوڵمەتم
چی دەکەم ئاخر لە سەیری باخ و بەی، بەم دەردەوە
هەروەکوو قەوس وقەزەح با دەس لە گەردن دانیشین [١]
تۆ بە سوخمەی ئاڵ و سەوز و مـن بـە رەنگـی زەردەوە
یەک نـەفەس چـاکـی نـەهێنا کـەعبەتەینی بەختەکـەم
شـــەش دەرم گــیراوە دامــاوم بــە دەســتی نــەردەوە
ئــیلتیماسی «تــاهیر»ی بــێچارە قــەد ســوودی نـی‌یە
تــۆکــە دایـم شـەڕفرۆشی بەو دڵـەی وەک بـەردەوە

* * *

١ ـ قەوس و قەزەح، حەوتەوانە یان رەنگین‌کەمان کە لە بەهاران پاش باران خـۆی دیاری ئەدات و زۆر جوانە. دەڵێ ئەگەر تۆ بە رەنگی سەوز و سوور و من بە رەنگی زەردی روخسارمەوە پێکەوە دانیشین وەکوو قەوس و قەزەح دیارین.

## غەزەلی ژمارە ـ٦ـ

مـەمکوژە جـانا بە هـیجران، ئەی جـەفا کـارم وەرە
تاب و تاقەت چوو بە جـارێ یـاری خـەمخوارم وەرە
بـۆچ ئەوەندە ئـارەزووت بـۆ قـەتلی ئەم بێچارەزار
کـوشتنی ئـاشق دریـغ مـەفەرموو، سـەردارم وەرە
بـولبولی زارم دەنـاڵم، قـەقنەسم ئـا گـر بەجان (١)
گا دەگریێم، گا دەسووتێم، یاری غەددارم وەرە (٢)
خاڵی کوڵمت هەر وەکوو فلفل ئەسووتێنێ دڵم (٣)
کـەس نـیە دەردم دەوا کـا، تـۆ بـە هـاوارم وەرە
دڵ لە دووریت ئـاگـری گـرت بەسیە یـاری نـازەنین
تۆی عـەلاجی دەردی «تـاهیر» زوو بە هـاوارم وەرە

---

١ ـ قەقنەس: مەلێکە کاتێ هێلکە دەکا بۆ ئەوەی جووجکەکانی هەڵبێنێ خۆی دەسووتێنێ و دەبێ بە خەڵووز و پاشان جووجکەکانی دێنە دنیا.

٢ ـ دیارە وەفایی مەهابادی زۆرکاری لە سەر شیعرەکانی تاهیربەگ‌داکردووە.

٣ ـ فلفل: بیبار. شاعیری بەناوبانگی ئێران قەسابی خوراسانی دەڵێ:

خال محبوبان سیاه و دانەی فلفل سیاه      هردو جان سوزند، اما این کجا و آن کجا

یانێ: خاڵی خۆشەویستان رەشە و دانەی بیباریش رەش، هەردوکیان سووتێنەری گیانن بەڵام ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ.

## غەزەلی ژمارە ـ٧ـ

تــیری خــەمزەی چــاوەکــانت وا لە جــەرگم کــاریە
ئێستە ئەشکم وا بە خــوڕ دێ، ڕەنگــەکــەی گــوڵناریە [١]
نــەفسی ســەرکەش، چــەند ڕۆژێ گــەر جـیهانت رام بـبێ
دڵ ئەگەر خۆش‌کەی بەخۆت، بێ‌عاری‌یە، بەم «عاریە»
گوڵ ئەگەر هات، خۆی موقابیل کا بە تۆ، لێـی نـاگـرم
هـــەرزەگـــۆیە و بـــێ وەفــایە، دولبــەری بــازاڕیــە
نــاشکێ قــوربان دڵـم، هــەرگیز لەبەر جەوری رەقـیب
عـــادەتی ئـــەو دائـــیمەن هــەر فـیتنەو و بــەدکاریە
لێــمگەڕێن تــەنهانشینی کــونجی خــەم بـم ئەی ڕەقـیب
دەردەکــەی مــن دەردی ئــەشقە و زۆر گـران و ساریە
زاهـــیدی خـــودین کــە حــەیوانــە لەوادی ئــەشقدا
ریشـــەکــەی پــان و درێــژی ڕەشــمەو و هــەوساریە

١ ـ ئەم شێوە دارشتنە زۆر ریئالیسمە و نیزیکە لە حەقیقەت بەراستی تاهیربەگ زۆر شتی لە ریئالیسم زانیوە، عەبدوڵلا گۆران شاعیری نوێ خواز و ریئالیسم دەڵێ:

ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێ ئاڵ　　قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ

سەبر و هۆش و رۆحی بردم هەر بەجارێ ئێستە کەش
هیچ نەما کاری بە من، پەیکاریە بەم کاریە
جارێ ناپرسی لە حالّی من مەگەر نازانی تۆ
زار و بێزار و نەزارم کاری من هەر زاریە
تازە زانیومە لە سەر دینی مەسیحایە نیگار
پەرچەمی عەینی سەلیبە زوڵفەکەی رەشماریە [١]
تاقەتی شیعری نەماوە هیچ لەبەر رەنج و فیراق
ئەم کەلامە گەر بڵێ «تاهیر» لەبەر بێعاریە

* * *

١ ـ سەلیب: هەر ئەو خاچەیە کە کچانی پاریس پاش شەری یەکەمی جیهانی زولفیان وەکوو سەلیب کردبوویان بە مۆد و ئێستاش هەر باوی ماوە، جا نازانم تاهیربەگ لە کوێیەوە ئەمەی زانیوە، ئایا ئەو شێوە مۆدە هاتبێتە کوردستان یان لە جێگایەکی ترا دیتوویە.

## غەزەلی ژمارە -٨-

دنیا کە هەموو لەحزە بە مەعشووقی کەسێکە [(١)]
بنوارە کە چەن قەحبە، چ کۆنە تەرەسێکە
تێ‌فکرە وەکوو کەلبی نیهان گیری زەمانە
ئەبنائی جیهان یەک بە یەکی، سەگمە گەسێکە
عالەم هەموو وەک تەیرە، تەمەع دانە، ئەمەل داو
سەییادی ئەجەل، ساحەتی دونیا قەفەسێکە [(٢)]

---

١ - لە پەندی پێشینیانا دەڵێن: ئەم دونیا وەکو چۆپی وایە هەر دەم وا بە دەست کەسێکەوە، لێرەدا تاهیربەگ تەشبیهی کردووە بە ژنی خراپ کە هەرکات و سات لە گەڵ یەکێکە و وەفای بۆکەس نییە. جا نازانم بۆچی تاهیربەگ کە لە بنەماڵەیەکی خاوەن شکۆ و دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندا بووە و هەموو شتیکی لە بەردەستدا بووە هێندە نەچەسپاوە بە دونیا و تەنانەت حکومەتی سەید سادقیشی کە لە لایەن بابیەوە پێی دراوە نەی‌ویستوە. جا زۆرتر دەوڵەمەندان دەچەسپن بە دونیاوە و دڵیان بەم دونیا خۆشە بەڵام تاهیربەگ وا نەبووە.

٢ - تاهیربەگ بیری فەلسەفی هەبووە بۆیە ئاوەها لە دونیا بیر دەکاتەوە، ئەو شیعرە بەرزانەی کە بۆ ناری و بابی نووسیوە پری بووە لە پرسیاری فەلسەفی بەڵام ئەجەل مەودای نەداوە زۆرتر لەم بارەوە بروات، جا لە بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار کەسێکی وەک تاهیربەگ گۆشەنشین بۆچی؟

لەم حــوجرەیی شەش گۆشەکە رێی مەعبەری عامە
یــارەب چیە هـەرکـەس بـە هـەواو و هـەوەسێکە
ســەد قــافڵە رابــورد و ئــەتۆ غــافڵی ئـەی دڵ
گـوێ بگـرە لە هـەر لایێ کە ناڵەی جەرەسێکە (١)
شــادی و خــەم و ئـەندووهـ چیە رەنج و ئـەلیمە
ئــیقبال و زەوالیش بــە خــوا هــەر نــەفەسێکە
«تـاهیر» مـەبە ئـازوردە، زەمـان عـادەتی جـەورە (٢)
دونــیا کــە هــەموو رۆژێ ژنـی بـولهەوەسێکە (٣)

* * *

---

١ ـ جەرەس: زەنگۆڵە، قافڵەچیان بۆ ئەوەی کاروانیانی دیکە ئاگادار بکەنەوە و پێی بزانن زەنگۆڵەیێکیان لەمل وشتر یان ئەسپەکەیان ئەکرد و لەدوورەوە دەنگی دەهات.

٢ ـ نالیی پارچە شیعرێکی هەیە بەم شێوەیە دەست پێ دەکا:

شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم مەشغووڵی نەفەس گرتنی موشکین نەفەسێکم

٣ ـ بولهەوەس: ئەوکەسەی کە هەوا و هەوەسی زۆرە و هەر ماوەیەک ژنێ دێنێ و دوایی لێی جودا دەبێتەوە و دوبارە ژنێ دیکە دێنێ. ژنیش هەیە هەر ماوەیێک مێردێ دەکا، کاترین مەلەکەی رووسیە دەڵێن هەموو شەوێ ژنی کەسێک بوو، بۆ ئەوەی کەسێ پێ نەزانێ بەیانی دەیکوشت، هەروەها پادشای داستانی هەزار و یەک شەویش هەمان کاری دەکرد، بۆیە شاعێر لێرە بروای بە مانەوەی لەم دونیا نی‌یە.

## غەزەلی ژمارە ـ٩ـ

فـیدای روخســاری ئـاڵت بـم ئـەڵێی خـورشیدی تـابانە
بـەلاگــەردانــی بـالاّت بـم وەکـوو شـمشادی بـوستانە
لە ســایەی تــیغی ئـەبرۆی تـۆ، لە رۆژی حـەشردا جـانا
بیحەمدیلا حـیسابی مـن لەگـەڵ جـەمعی شـەهیدانـە (١)
دەزانــی بـۆچی مـەسروورم، ئـیشارەی کـردمێ دولبـەر
وتــی حـازر بـە بـۆکـوشتن بـەیانی جـەژنی قـوربانە (٢)
لە ئــاهم گــەر بســووتێ ئـاسمان بـاوەڕ بکـەن ئـەمشەو
ئــیتر یــاران، چ بــاکـێکم لە ســەردیی فـەسڵی زسـتانە

---

١ ـ مەستوورەی کوردستانی دەڵێ:

لە کوشتن گەردنت ئازاد دەکەم گەر بێتە سەر قەبرم
بە رۆژی جومعە بمنێژی لە لای جەمعی شـەهیدانت
کەسێ تۆ کوشتبێت رۆژی حەشرا زەحمەتی نادەن
ئەگەر وەك من لە ئەم دونیایە سووتابێ لە هیجرانت

٢ ـ مەحوی دەڵێ:

کە دادی یەئسی خۆمم بردە لا، ئەم عارفە توند بوو
وتی ئاخر سبەینێ جەژنە خوێنی تۆ لە پێ دەگرم.

کــە زولفــی عــاریزی پۆشی وتـم یـاڕەب چ سرڕێکە
لە لایـــێ زوڵــمەتی کــوفرە، لە لایــێ نــووری ئــیمانە
دەبێ کاول بـێ مـوڵکی دڵ بـە تـاراجـی سـوپاهی خـەم
هــەتا شــاهەنشەهی ئــیشقت لەوێــدا مــیسلی ســوڵتانە
بەدەس بـادی سـەبا چـونکە پەشێوە نـەزمی زولفـەینت
مــنی چــارە ســیا بــۆیە هــەموو نــەزمم پــەرێشانە (١)
مەکەن تیماری زەخمی جەرگی «تاهیر» ئەی تەبیب ئاخر
بــزانــن بــا، لە حــەشرا ئــەو شــەهیدی تیری مـوژگانە

* * *

١ - نالی دەڵێ:

مەکەن مەنعی پەشێوی دڵ کە ئەمشەو پەشێواوە لەبەر پەچەم پەشێوان

## غەزەلی ژمارە ـ ١٠ ـ

ئەی پەرتەوی رەنگت وەکوو رەنگی هەمەرەنگە
خاڵت بە مەسەل زولفی سیاهت، شەوە زەنگە
بەزم و تەرەب ئامادەیە، ساقی مەیێ فەرموو
دەنگی دەف و ناڵەی نەی و ئاوازەیی چەنگە
لێوت کە وەکوو لەعلی بەدەخشانە بە ئاڵی (١)
گەنجوور و نگەهبانی دەهان و دەمی تەنگە
تابووری موژانت لەگەڵ ئەگریجە بەرابەر
وەستاوە ئەڵێی لەشکری ژاپۆن و فەرەنگە (٢)
سەد نامی خودا بێ لە دوو پوستانی ئەنارت (٣)
گرد و شلک و نازک و پڕ چنگ و قەشەنگە

---

١ ـ بەدەخشان: ناوچەیێکە لە ئەفغانستان کە بەردی لەعلی هەیە و زۆربەی شاعیران ناوی ئەبەن.

٢ ـ مەبەستی شەری روسیە و ژاپۆنە کە لە ساڵی ١٩٠٥ی ز پێش شەری یەکەمی جیهانی رووی دا و لەو شەرەدا ژاپۆن سەرکەوت.

٣ ـ پوستان: مەمک، ئەنار: هەنار لێرەدا شاعیر مەمکی بە هەنار شوبهاندوە. لە ئەدەبی کوردیدا بە پرتەقاڵ و سێو و لیمۆ و بەهێ تەشبیە کراوە.

بـۆ بـاری خـەمت گـەر بەدەنم سـتە مەڕەنجە (١)
پـێکراوی مـوژەی تـۆیە نـە کـوژراوی تـفەنگە
سـەرگەشتەو و ئـاشوفتەیی ئـەشقم وەکوو فەرهاد
کـێوم بـەدڵ و سـینە و سـەر، پـەنجە قـوڵەنگە
چـاوت بـە مـەسەل ئـافەتی دڵـهایە وەلیکـن
بـۆچ وایـە کـە ئەبرۆیی کەچت مەیلی وە جـەنگە
لەم رۆژە کـە رووم خستە بەری پـێ‌یو وتـی پـێم (٢)
ئـەی ئەبلەهە، کەی مـاڵشی ئـاوێنە بە سـەنگە؟ (٣)
مەنعی مەکـە «تـاهیر» کـە ئـەگـەر مـات و خـەمۆشە
دێوانـەیی رووی تـۆیە نـە مـەستی مـەی و بـەنگە (٤)

* * *

---

١ ـ مامۆستا سەجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردی لاپەرەی ٤٧٨ ئەم دێرەی ئاوا هێناوە: « سەیدی دڵی من خەستەو و خوێنینە بەقوربان »
٢ ـ «عاجز بوو کە رووم خستە بەری پێی و وتی پێم». مامۆستا سەجادی هەمان لاپەرە.
٣ ـ یانێ وتی دڵی من وەکوو بەردە و دڵی توو وەکوو ئاوێنەیە یەک ناگرنەوە.
٤ ـ بەنگ: جۆرە نەشەجاتێکە وەکوو تەریاک و حەشیش، سەرخۆشی دێنێ.
هەروەها مامۆستا سەجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا وای نووسیوە:
دیوانەیی روی تۆیە، نە شێت و نە ئەبەنگە.

## پرسیارێکی «تاهیربەگ» لە مەلاکاکە حەمەی بێلوو [1] «ناری»

### غەزەلی ژمارە ـ ١١ ـ

خـــودا عـــەدلی لە لای عـــارف عـــەیانە
بـــە حـــەققەت ئـــێمە گـــەللەین، ئەو شـوانە !
لە بەرچی وامەڕی خۆی مەردی چوپان ؟
بـــە دەســتی خـــۆی ئـــەخاتە بـــەر نیشانە [2]

* * *

ئەگەر موئمین بە حـەققەت دۆستی حـەققن ؟
چـــی‌یە حـــیکمەت زەلیـــلی رووســـیانە ؟
مـــوقەددەر بـــووکـــە گـــەندوم بـێ بە رزقی
لە ئـــادەم بـــۆ دەبـــێ بگـــرێ بـــەهانە ؟

---

١ ـ ئەم شیعرەمان لە دیوانی ناری چاپی ١٩٨٤ی ز لە ئامادەکردنی کاکەی فەللاح دەرهێناوە.

٢ ـ ئەمە پیشاندەری ئەوەیە کە تاهیربەگ مێشکی پڕ بووە لەم پرسیارانە.

کــە تــیرئەندازی چــابوک دڵ بــپێکێ!
قــەباحەت کـەی لە سەر حـەڵقەی کـەوانـە ؟
کــە ئــەو روخســاری دڵ بــێنێتە پــێشۆ
نــــەسیبی بـــــولبولان داد و فـــوغانە

* * *

لە رۆژی خــۆی عـــەمەل قسـمەت کـراوە
لە بـــەرچـــی تـۆ دەڵــێ فـیعلی خـۆمانە؟
کــــەوابــــوو ئـــاگـری دۆزەخ لە بـۆمان!
چ لازم دێ بکـــــێشێ وا زەبـــــانە ؟

* * *

ئـــەگـــەر خـــەلقە لە بــۆمان ئـیختیارێ
لە بـەر چـی یـەک بچووک و یـەک کـەلاّنە
یـــەکـــێ بــۆ پـارە نـانێ جـان فـرۆشە
یـــەکـــێ حـــەققی نـــیە شـاهی جـیهانە

* * *

یـــەکـــێ ســـوڵتانی قـەسری زەرنـیگارە
یـــەکـێ بـێ جـێگەو و بـێ خـان و مـانە
یـەکـێ دایـم خـەریکی عـەیش و نـۆشە
یـــەکـــێ کـــوژراوی شـــمشێری دەبـانە

یـــەکـێ قـاروونی دەوڵـەت هـەم عـینانە
یەکـێ مـوحتاجی سککەی یەک قـرانە [١]

ولاٚمی «ناری» بۆ «تاهیربەگ» [٢]

غەزەلی ژمارە ـ ١٢ ـ

سـوئالت ئـەی سـوخەن سـەنجی زەمـانە [٣]
ئـــەساسی عـــیجز و تـــەشویش و مـــەلانە
حـــەقیقەت قســـمەتی ئـــەحواڵـی عـالەم
دەلیـــــلی زەبت و ئـــــەحکامی نـــیهانە
* * *

١ ـ بیری فەلـەفی و پێشکەوتوانەی تاهیربەگ لەم شیعرەدا روون دەبێتەوە.
٢ ـ ئەم شیعرەش لە دیوانی ناری چاپی ١٩٨٤ی ز لە ئامادەکردنی کاکەی فەللاح دەرمانهێناوە.
٣ ـ ئایا ئەم ولاٚمە تاهیربەگی زانا و رووناکبیری رازی کردووە؟ !!!

کەسێ عارف بە حوکمی پادشایە !
کە مەحرەم بێ بە رازی خوسرەوانە !
وەلێ مەجبوورە فیکرم بۆ جەوابت
ئەگەر چی عاجزی دەوری زەمانە
* * *
تەریقی «لأُنَسَلِّم» با نەمێنێ
نەبێتە بەحس وگاڵەی مازووانە
بەڵێ عەدلی خودا وەک میهری ئەنوەر
لە لای ئەهلی بەصیرەت بێ گومانە
* * *
وەکوو سەمع و بەصەر عیلم و حەیاتی
کەلامی قودرەت و زاتی عەیانە
لە بەینی کەسبی عەبد و خەلقی خالیق
تەفاوت وەک زەمین تا ئاسمانە
* * *
کە کەسبی مەصدەر و حوسن و قەباحەت
قەباحەت وەسفی کەسبی عاصییانە
خوا بێ نەقسە، وەسفی زات و خوڵقی
بە ئەحسەن خوڵقە مەشهووری جیهانە

بــەڵێ حـــەق راعـــیە و گـــەللە خـەلایق
عـــیبادەت رۆن و شـــیر و تـــووکیانە (١)
پـەزی بـێ فەرع و پەشمە و عەبڕەش و لەڕ
ســــزاواری ســــەگـــی یـــونانیانە

* * *

کـــەسێ لادا لە جـیلوەی حـوسنی ئـیشقی
ئـــەکـــێشێ ئـــێشی نـــەشتەر بـــولبولانە
نـــیە نـــەقسی و زەلیـلی دەسـتی رووسـی
جـــەزای زیـــللەت کـــە قـەسری حـۆرییانە

* * *

تـــەماشا کـــە لە بـــۆ تـــەعلیمی عـــیرفان
فـەلاقەی کـوڕ دەکـەن ئـەم رۆمـی یانە (٢)

---

١ ـ مەبەستی کوڵک و مووی مەر و ماڵاتە.

٢ ـ مەبەستی رۆمی رۆژهەڵاتە واتە «شـرقی» «قـوستەنتەنیە» ئـیستامبووڵی ئـێستا پایتەختی پێشووی ترکیە کە لە ساڵی ١٤٥٣ی زایینی بەدەستی سوڵتان موحەممەدی فاتیح سوڵتانی عوسمانی گیرا و رنێسانس لەوکاتەوە لە فلورانسی ئیتالیا واتا رۆمـی رۆژئاوا «غربی» دەستی پێ کرد. پاش روخانی رۆمی رۆژهەلات و دەسەڵاتداریتی عوسمانی، زۆربەی خەڵکی ناچەکانی دیکەی سەربە ئەم ئیمپراتوریە، ئیستامبولیان بە رۆم ناو ئەبرد.

جـــەهەنەم بـــا لە جـــۆشا بـــێ جـــەهەننەم
چـــــە بـــیمی بـــۆ گـــروهی مـــوئمینانە

* * *

بـەموئمین چـی، سـەقەر، دۆزەخ، جـەهەننەم
مـــــەقامی رووســـــیان و رووســـــیانە (۱)

* * *

۱ - ئەم دوو وشەی رووسیان و رووسیانە «جیناس»ە مەبەستی یەکەم رووسیە، وە ئەوانەی کە خەڵکی رووسن، مەبەستی دووهەم، روو رەشییە. لێرەدا بـۆمان روون ئەبێتەوە کە رووسیەی تزاری و کومۆنیست ئەوەندە بۆ کورد خراپ بوون تەنانەت رۆیشتووەتە نێو ئەدەبیاتی کوردەوە. ئێستایش پیاوان و ژنانی بە تەمەن ئەگەر کەسێک فیعلی خراپ لێی سەر بدات پێی دەڵێن رووسی.

« پیتی - یێ - » غەزەلی ژمارە ـ ١ ـ

چـەمەن یـەک بـارە خـامۆشە خـرۆشی بولبولان، بـابێ
دڵ ئـەمرۆ مـات و مـەدهۆشە خـوا فـەسڵی گـوڵان بـابێ
ئـەگـەر مـەیلت لە سـەرمانە چ حـاجەت ئـابی حـەیوانـە
لە لێـــوی لەعـــلی جـانانە حـەیاتی جـاویدان، بـابێ
نـەماوە حـاڵەت و ژیـنم لە دەس چـوو رۆحـی شـیرینم
رەفیقان بێن بکـەن شـینم سـەدای گـریە و فـوغان، بـابێ
ئـەسیری تـاری گـیسووتم هـیلاکـی چـاوی جـادووتم
شـەهیدی تێغی ئـەبرووتم دەسـا عیسای زەمـان، بـابێ
بـیحەمدیلا گـوڵی رەعـنا، شکـاندی رەونـەقی لەیـلا
بـڵێن مـەجنوونە کـەی شـەیدا رەئیسی ئـاشقان، بـابێ
زەمـــانە بـــەزمی رنـــدانــە بـدە سـاقی بـە پـەیمانە
لە بـەر تـەعزیمی مـەیخانە بـڵێن پـیری مـوغان، بـابێ
ئەلا ئەی ئاشقی مەدهۆش وەکوو «تاهیر» مەبە خامۆش
لەبـەر سـۆزی دڵـی پڕجۆش، نـەوایـی مـوتریبان، بـابێ

* * *

## غەزەلی ژمارە -٢-

لە دەوری پیری مەیخانە، سەدایی موتریبان با بێ
لە تاریکی شەبی هیجران، چرای دەفعی خەمان با بێ
لەناو بەزمی حەریفاندا، لە زومرەی بەزمی رەندانـدا
لە ناڵینی غەریباندا، دەوای دەردی دڵان با بێ
لە بەر ناڵەی حەزینی من، لە بەر شین و گرینی من
لە بەر دەردی برینی من، نەسیمی هەم زەبان با بێ
غولامی سەروی باڵاتم، ئەسیری زولفی تاتاتم
شەهیدی چاوی شەهلاتم، قرانی ئاشقان با بێ
لە هیجرانی خەزان تاکەی، بە ئومیدی گوڵان تاکەی
لە نەغمەی بولبولان تاکەی، خوا فەسڵی گوڵان با بێ
زەمانە بەزمی رەندانە، بدە ساقی بە پەیمانە
لە بەر تەعزیمی مەیخانە، بڵێن پیری موغان با بێ
نەماوە حاڵەت و ژینم، لە دەس چوو رۆحی شیرینم
رەفیقان پێن بکەن شینم، سەدای گریە و فوغان با بێ
کە «تاهیر» قور بەسەر ماوە، سەراپا غەرقی خوێناوە
ئەڵێن دووبارە کوژراوە، تەبیبی حازقان با بێ

## غەزەلی ژمارە -٣-

موقەددەر گەر نەبێ ئاخر لە میهری مەهـ روخانم چی
لە نالەنالی نیوەی شەو لە ئاهی بەربەیانم چی
نیشانەی ئیفتیخاری من لە سینەم داخی هیجرانە
بڕۆ ئەی ناسحی موشفیق لە روتبە و یا نیشانم چی
غەرەز وابوو موقابیل کەم لە گەڵ گوڵ رەنگی روخسارت
وەگەر نەیبێ قەدی سەروت لە سەیری گوڵستانم چی
کە من میحرابی ئەبرۆی تۆ مەقامی سوجدەگاهم بێ
ئیتر وەک زاهیدی خودبین لە مەوعیدی جینانم چی
شەوم وەک رۆژی روونا کە لە شوعلەی روومەتی ئاڵت
بەڵێ یەکبارە با ون بێ، لە ماهی ئاسمانم چی
بە نەیرەنگی فەلەک جانا لە دڵما دەرنەچوو میهرت
کە من یەک رەنگ و یەک نەوعم لە تەبدیلی زەمانم چی
بە من قەت نادرێ تەفسیری ئایاتی سەری کوڵمت
گرانە «تاهیر»ا بۆ من لە تەعریف و بەیانم چی

* * *

## غەزەلی ژمارە ـ ٤ ـ

عـیلاجی دەردی ئـیشقی خـونچەی لێـوی شەککـەرباری [١]
گــوڵ و شــەککــەر دەبـارێنێ بـە حـەققەت نـوتقی گـوفتاری
فــەلەک زانــی کــە دەشکـێ رەونـەقی بـازاڕی مـانگ و خـۆر
شکــاندی پــەنجەکــەم تـا مـن نـەنووسم وەسـفی روخسـاری
بــەغەمزەی نـیم نـیگاهی ســەد دڵــی بــێچارە مــەحبووسە
لە بــابل خـوێندوویە ئـەفسوون دوو چـاوی بیچووە عـەیاری
بە شوعلەی شەمعی روخساری دەسووتێ دڵ وەکـوو قـەقنەس
وتـــم پـــەروانـــەیە، یـــاڕەب نـیە وا بـــانگ و هـــاواری [٢]
وەکوو یوسف ئەگەرچی موشتەری وەستاوە سەف‌دەرسەف [٣]
وەکـــوو «تـــاهیر» نـیە ئـەمڕۆ بـە جـان و دڵ خـەریداری

---

١ ـ تاهیربەگ ئەم هەڵبەستەی کاتێ ووتـوەکـە دەچـێ بـۆ راو و لەکـاتی راودا پەنجەیێکی وەبەرگوللەی تفەنگەکەی دەکەوێ و برینداردەبێ.

٢ ـ پەپوولە یان پەروانە: ئەوەند ئەوینداری شەمەکاتێ کە بە دەوریدا دەگەرێ و خۆی نزیک دەکاتەوە تاکوو ئەسووتێ و هیچ دەنگێکی لێوە نایێت، تاهیربەگ لێرەدا دڵی خۆی بە ئەو پەروانە تەشبیە ئەکا دەسووتێ و هیچ دەنگ ناکات.

٣ ـ حەزرەتی یوسف هیندە جوان چاک بووە ژنان و کچانی میسر بۆ تەماشای بە سەف رادەوستان.

## غەزەلی ژمارە -٥-

سەدکە پاشای،[١] حەز بکەی هەر جۆر موکافاتم ئەدەی[٢]
من قسەی حەق هەر ئەکەم سا چۆن موجازاتم ئەدەی
من بە تەختی خوسرەو و جامی جیهانی تێ ئەگەم[٣]
تۆ بە مەئموور و ئیعانەی دۆم و خەڕاتم ئەکەی
«من بە سەد مینەت لە نەحلی لێوی یاری خۆم ئەخۆم[٤]
تۆ بە شاگردی دوکانی مەروەقە و نانم ئەکەی
من رەزا نابم بە نانی گەندومی ئادەم فەریب
تۆ ئومیدی کوورەخانەی نانەواخانم ئەکەی»

---

١ - پاشا: مەبەستی وەسمان پاشای جافە، بابی تاهیربەگی جاف.
٢ - تاهیربەگ ئەم هەڵبەستەی لە وڵامی باوکیدا نووسیوە، کە داوای لێ کردووە پچێ بۆ سەید سادق و لەوێ ببێتە حاکم. بەڵام تاهیربەگ پێی خۆش نەبووە و بەم هەڵبەستەکە بۆی ناردوویەتی نارەزایی خۆی دەربڕیوە.
٣ - دەڵێ من دەزانم وەکوو خەسرەو و پەرویز پادشای ئێران حکومەت بکەم بەڵام قبووڵی ناکەم.
٤ - ئەم دوو بەیتە لەگەڵ ئەوانیتردا رێک ناکەون، هەرچی هەوڵماندا بۆمان ساغ نەکرایەوە.

مــــن لە شــــاهی خـــــاوەنی فــــێڵ و عـــــەلەم پـــەروام نــیە
تــۆ بــە ژێــر دەســتی پــیادە و ئــەسپەوە [١] مــاتم ئــە کــەی
فـــــیالمـــــقل مـــــن مـــــوسلیمم دەعــوای مــوسڵمانیم هــەیە
تــۆ حــەواڵــەی مــەسئەلەی ئــینجیل و تــەوراتــم ئــەکــەی [٢]
نــەزم و نــەسری «تــاهیر» ئــیمڕۆ بــۆتە ئــەورادی زبــان [٣]
تـــازە دێـــــی فــێری قــەسیدە و شــیعر و ئــەبیاتم ئــەکــەی

* * *

---

١ - چەند مۆرەێکن لە یاری شەترەنج.

٢ - یانێ شتێ کە من پێم خۆش نی‌یە تۆ ئەتەوێ بە سەری منا دای‌سەپێنی. مەبەستی حوکمداری سەید سادیقە کە دوور بوە لە ئەندێشەی تاهیربەگ کە بە سـەر خـەڵکا حکومەت بکا ئەویش لەوکاتەکە برا لە سەر حکومەت برای خۆی دەکوشت بەڵام تاهیربەگ خۆی لێ پاراستووە.

٣ - تاهیربەگ لێرە دەڵێ: شیعر و نەسری من بیر و ڕەفتار و کارەکانم ئەوەیە کە لە سیاسەتدا بەشداری نەکەم بۆیە بووەتە وێردی زمانی هەموو کەس و خەڵکی کردووەتە شایەت و هەموان دەزانن من حەزم لە حکوومەت نی‌یە.

## غەزەلی ژمارە -٦-

مەربووتە حەیاتم بە بیارە و بە دیاری (١)
خۆزگەم بە سەگی قاپیەکەی قوتبی مەداری
ئەم کاولە دونیایە لە نەو زێر و زەبەر بێ
پاش ئەحمەدی موختار و ئەبووبەکر و سێ یاری (٢)
فاروقی زەمان حەزرەتی نائیبی شێخ عوسمان (٣)
واسڵ بوو بە دەرگاهی کەرەم، رەحمەتی باری
ئەم حوجرەیە کە جێی تەوافگەهی حەزرەتی شێخە
یەکسەر هەموو ئەنوارە چ سەقف و چ کەناری
هەر دەم بۆ تەوافی، جەمعی مەلەک دێن
خاڵیی نیە یەک ئانێ، نە حوجرە و نە حەساری

---

١ - شێخ رەزای تاڵەبانی دەڵێ:
مەربووتە حەیاتم بە سولەیمانی و خاکی   خۆزگەم بە سەگی قاپیەکەی ئەحمەدی کاکی.
٢ - مەبەستی حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلییە «د - خ».
٣ - مەبەستی جێنشینی شێخ عوسمانی یەکەم شێخ عومەری بیارەیە بابی شێخ عەلاالدینی بیارە و باپیری شێخ عوسمانی دووهەم «شێخ عوسمانی دوورۆ» کە لە تورکیە کۆچی دوایی کرد.

ئەم حوجرە لە حەرەمدا تەوافی بۆ نی‌یە هەرگیز
مەجمووعی مەلائیکە هەموو بۆتە زەواری
حاجی وەرە ئەم قاپییە گەر تالیبی دینی
سەد حەج و دووسەد عومرە تەوافێکی مەزاری
سەد شوکری خوا لازمە بۆ جەمعی موریدان
خاڵی نیە جێگەیی، وەک ئابادی دیاری
ئەی نەجمی هونەر،مەزهەری حەق و مەهـ و خورشید
لازم نیە وەسفت، لە هەموو لاوە دیاری
گەر تالیبی یاری سا روو بکە خورشید
ئەی خالیدی بێ چارە تۆ بەم دەردە دووچاری
تا تۆزی دەری قاپیەکەی نەیکەیە چاوت
ئەم کێوەکەکانی حەسەدە، ناکرێ چاری
فیکرت کە لە ڕێ باری حەسەد ڕێ ڕم و شێرە
بێ خاوەنە، بێ ڕێگە، لە شەیتانە سواری
ئەی قافلە سالار، وەی ئافەتی مەهـ و خورشید
تۆ مەرقەدی گەیلانی و پیرانی بوخاری
ڕەحمێ بکە بەم «تاهیر»ی بێچارەیی مسکین
مەهجووری دڵی، وا لە دونیادا بێزاری

* * *

## غەزەلی ژمارە ـ٧ـ

ئەلا ئەی ئەقڵی کۆتایین هـەتاکـەی مـات و دامـاوی
بە قەیدی نەفسی ئەممارە سەراسـەر بـۆچی بـەسراوی
خەیاڵی هیچ و پووچت وایە دەوڵەت هەمعەنانت بێ
حیسابێکە، کە موحتاجی نەسیبی دووگەزە جاوی [١]
مەسەل دونیایە صەییاد و ئەتۆش مورغێکی بێهۆشی
مـوقەیید بـە بـەیەک دانـە هـەتا نـەتخاتە نـاو داوی
زەمانە هەر وەکوو قەحبە هەمئاغۆشی هـەزارانـە [٢]
چ سوودێکی هەیە بـۆ تـۆکـە سـەردانـێی لە پێناوی
مەبەستە دڵ بە دونیا «تاهیر»ا بێسوودە بۆ هەرکەس
مـەحاڵە نـاگـیرێ بـۆ تـۆگـوریزکـە، سـا لەگـێژاوی

* * *

---

١ ـ جا لێرەدا بۆمان روون ئەبێتەوە کە تاهیربەگ هێندە خۆی نـەبەستوونەوە بـەم دنیایە کە دەزانێ هەر وەکوو چۆپییەو رۆژێ کەسێ دەیگرێ بە دەستەوەو دوایی بەدووگەزە کفنەوە لەم دنیادەروا.

٢ ـ شێخ رەزای تاڵەبانی دەڵێ:

لەم رێگەیە تەقدیری ئەزەل وابووکە ئێمە   پاماڵی جەفا بین و رەقیب سەیر و سەفاکا.

# تێهەڵکێش ـ «تەخمیس»

## بیروڕای مامۆستا هیمن دەربارەی تێهەڵکیشی شاعیران

## لە سەر شیعری شاعیرانی دیکە.

جارێک لە ورمێ کۆڕێکی دۆستانەمان بۆ شاعیری نەمر مامۆستا هێمن دانا و لە ناو پرسیارەکاندا دەربارەی تەخمیسی شاعیران لە سەر شیعری شاعیرانی دیکە پرسیارێکیان لێ کرد پێش ئەوەی مامۆستا وەقسە بێت یەکێ وتی:

مامۆستا بە بڕوای من هەرکەسێک تەخمیس لە سەر شیعری شاعیرێک بدات وەکوو ئەوە وایە لە سەر سفرەی ئەو شاعیرە نان بخوات. بەڵام مامۆستا فەرمووی:

چەند رۆژ لەمەوپێش لە مەهاباد مەلا غەفووری مهابادی «دەباغی»م بینی تەخمیسێکی لە سەر شیعرێکی منا دابوو وتی مامۆستا پێت چۆنە؟ وتم بەڕاستی ئەوەی من نەمتوانیبوو لەو شیعرەدا دەری‌ببڕم هاتویتە ناو دڵمەوە و دەرت بڕیوە.!!! ئێستاش دەڵێم هەرکەسێک تەخمیس لە سەر شیعری هەر شاعیرێک بکات وەکوو مەلەوانێکی کارامەیە کە چووبێتە ناو دڵی ئەو شاعیرەوە و هەر شتێکی تێدا مابێت دەری بێنێت.

## پێنج خشتەکی « ئەدیب » لەسەر هەڵبەستی:

« قوربانی روخت بم کە شکستی بە قەمەردا »

---

کــێ دیـتوویە وا حـوسن و لەتـافەت لەبەشەردا
چـاوت کـە هـەموو غـارەت و قـەتڵی لەنـەزەردا
قـەتڵی مـنی مـەزڵومی بـە یـەک غـەمزە خـەبەردا
«قــوربانی روخت بــم کـە شکـستی بـە قـەمەر دا
حـەیرانـی لەبت بـم کـە رەواجـی بـەشەککـەردا»

* * *

ئـەمڕۆ کــە لەبـەر خـاڵی تـۆ مـوستەغنی‌لەمێشکم
بــۆ شـاهیدی دەردی دڵـی شـەیدا لەبـی ویشکـم
چۆن هیندە دەروون پڕ خەم و خوێناوی سـرشکم
«هەرچەندە دەکەم سەعی لەبەر خوێنی سـرێشکم
خاکـێ نـیە بـیکەم بـە هـەوەس گـاهێ بـەسەردا»

* * *

ڕۆژێکی کەرەم فەرموو لەرووی لوتف و کەماڵات
تا بۆ بەڵەدیی خاڵ و خەتت بێمە موتاڵات
سەیری قەمەر و لەعلی لەبت کەم قەد و باڵات
«دڵ ڕۆیوە قوربان لە وجوودم بە خەیاڵات
دایم لە سەفەر دایە ئەگەر چی لە حەزەردا»

* * *

تا وەسڵی لە ئاوێنەیی دڵ دێ بە تەفەئول
پەروانە بە ڕوی شەمعی نەما تابی تەئەممول
لەو سەیلی خەمت نابێ ئەمانم بە تەحەممول
«ناحەق نیە ناوەستێ ئەگەر پردی تەحەممول
سیروانی سروشکم کە ئەکا هاژە لە سەردا»

* * *

لەو ڕۆژەوە رووی کردە چرای بەزمی حەریفان
وا چارەیی من بوو وەرەقی زەردی خەریفان
گەر نەیبوو لەبەر مەستیە پەروایی ئەسیفان
«مەحفووز لەبەرکوشتنی عوششاقی خەفیفان
وەختێ کە دەکا خەنجەری تێژی بە کەمەردا»

* * *

نـاپرسی لەبـەر حـیشمەت و ئـیقباڵ و جـەلالت
لەو کـێوکەنی کـوشتە بـە ئـوممیدی وەسـاڵت (١)
شـــیرینە بـە شـەیدا ئـەلەم و ژەهـری وەبـاڵت
«ئەستێرە هـەموو مـەحوە لەنـێو نووری جـەماڵت
چون شەمسی روخی تۆ شـەوی گـێڕاوە بـەفەردا»

* * *

ئـەی بـوئەلەمی مـن کـە تـۆ لوقـمانی ئـەمینی
شـــیرین دەهــەن و شـوهرەیی ئـافاقی زەمـینی
جـارێ بـڵێ بێچارە «ئـەدیب» بـۆچی حـەزینی
«مـەیلی هـەیە «تـاهیر» کـە بـپرسی لە برینی
لەو دولبەرە پـرسن کـە چ تـیری لە جگـەردا» (٢)

* * *

١ ـ مەبەستی فەرهادی کێوکەنە کە بۆ گەیشتن بە شیرین کێوی کون کرد.
٢ ـ ئەم تەخمیسە لەگەڵ شیعرەکەی تاهیربەگا هیندێ جیاوازی هەیە.

پێنج خشتەکی ئەسعەد راستین « ژیان » لەسەر هەڵبەستی:

« نەماوە شاری بابل چاهی هارووت »

ژیــــانی گــــیانە چــۆنە ئــاشقی رووت
هــــیلالی مــــانگی تــابانە، دوو ئــەبرووت
دڵــی بــردم شکــەنجی پــەرچــەمی مــووت
«نــەماوە شــاری بــابل چــاهی هــارووت
لەکوێ خوێندویە ئەفسوون چاوی جادووت»

* * *

بـــــزەت دەشـــوا گـــوناهی لایـــەقانت
قـــــەد و بـــــالاّتە دار إنّالحـــــقانت
چ خـــۆشە ئــەشقی عــوزرا و وامــەقانت
«دەڵـــــێ تــۆراوە قــیبلەی ئــاشقانت
کە ئەمرۆکەچ بووە میحرابی ئەبرووت»

* * *

بــەهاری ئــەشقی بــێ بــارانــی ویشکــم
لە شــەوقی، شــەفەقی ســوورە ســروشکم

خـــودایـا مــن لە مــەشقی ئـەشقی نـەشکم
«وەکـوو مـەرجـانی ئـاڵە رەنگـی ئەشکم
لە تـاو روخسـاری لەعل و لێـوی یـاقووت»
* * *
لە خـــونچەی لێـوی تـۆیە جـوانـی جوانـە
چ جـــوانـــە پــێکەنینت گـــیانی گـــیانە
هـــەناسەت خـــۆشە ســـروەی بـــەربەیانە
«عـــەجەب ســـیڕڕێ لە ئـــەبروتا عـەیانە
موخالیف پێکەون هـەم تـاق و هـەمجووت»
* * *
ئــەگـەرچــی گـوڵ لە بـاخا نـەرم ئـەشنیا
خـــەزان خـــزیا و گـوڵی روخســاری رنـیا
«ژیـــان» جـــوانـــی دەمــێنێ لێ بــە تـەنیا
«وەرە «تـــاهیر» مـــەبەستە دڵ بـــە دنـیا
بــە زاهـیر جـوان و بـاتین، پـیر و فەرتووت»

* * *

## پێنج خشتەکی « شێخ موحەممەدی گولاّنی هەڵەبجەیی »

« هەر چەندە دەمێکە لە خەما غەرقەیی خوونم »

---

مەعلوومە لە دونیاکە بە بێ رەحلەتی چوونم
بێ سوود و سەمەر هەرچی هەیە فێڵ و فنوونم
بۆ موسبەتی کەزاییە شاهیدە، رەنگیی روونم
«هەر چەندە دەمێکە لە خەما غەرقەیی خوونم
هەرلەحزە لە دەس جەوری فەلەک مات و زەبوونم»

* * *

ئەوسا لە ئەقڵدا، نەبوو پێش‌کەوتوو لە فەوقم
ئێستا لە بیابانی جەهل ماتڵ و عەوقم
سووتاوە بە کبریتی [1] جەفا خەرمەنی زەوقم
«بەسراوە بە زنجیری ئەلەم گەردەنی شەوقم
مەشهوورە لەنێو ئەهلی زەمان شۆری جنوونم»

---

١ ـ کبریت: شەمچە، شقارتە، گۆگرد.

وەختێ کە خەیاڵم لە هەوای دابی فەرەنگ بوو
سەرکاسی سەدای چەغغانەو و بەربەت و چەنگ بوو (۱)
مەستیم لە مەی و لە قونیاغ و لە بەنگ بوو
«ئەلفی قەدەکەم راست وەکوو تیری خەدەنگ‌بوو
سەد داخ کە ئێستاکە دەڵێن حەڵقەیی نوونم»

* * *

هەر خۆشی کەدیبووم لەمەوپێش وەکوو خەو بوو
شادی و فەرەحم گشتی بە فیدای قەدی ئەو بوو
دەرمانی برینی جگەری سووختە بە ئەو بوو
«مەعشووقەکە وا موونسی رۆژ هەمدەمی شەو بوو
وەک ئاهوویی رەم‌کەردە لە چنگ بەختی نگوونم»

* * *

حەیران و پەرێشان لە فیراقی روخی دڵدار
چاو تیرە و دڵ خیرەو و مەدهۆشە وەکوو هار
بێ فائیدەیە هەرچی بکەم ناڵەو و هاوار
«دڵ موڵکی عەجەم، عەسکەری خەم، لەشکری سالار
وێرانی ئەکا ئاخری، بێ سوودە فسوونم»

---

۱ - چەند ئالەتێکن لە مۆسیقی.

ئـەم نـوکتەیە مـەوهوومە لەنـێو ئـەهلی شـەریعەت
بـــێنۆ بگـــرن حـــەڵقەیی ئـــەوباشی تـــەریقەت
مـــەشغوڵ بـــبن و تـــێفکرن چـاک بـە دیـققەت
«مـــەرهەم کـــە شـەفابەخشی بـرینە بـە حـەقیقەت
وەک داخـــی لە سـەر داخـە لە بۆ داخـی دەروونـم»

* * *

مـــەخلوقی زەمـــانە چ عـــەجەب ورد و درشـــتی
تـــالیب بـــەزەڕن جـوملە بـە نـەرمی و بـە زشـتی
لاکـــن دڵـــی مـــن واتـــە کـــە بـێزارە لە گشـتی
«چـوونکو هـەموو شـێواوە جـیهان تـەرز ورەوشـتی
یـەکسـانە لە لام شـادیی و غـەم بـوون و نەبوونم»

* * *

ئـەمڕۆ کـە لە مـەیدانـی فەساحەت وەکـوو مـەردم
مـەبسووت و مـوننەزەم خـۆش و پـڕمەعنیی فـەردم
بـــنواڕە بـــە دیـــققەت لە هـەناسەی دڵـی سـەردم
«سەد شوکری خـوا مـەرکەزی سـەد مـیحنەت و دەردم
وا تـــێمەگـــە لەم دائـــیرەیی چـەرخـە بـروونم»

* * *

مەحکوومی «عەلی» کۆفتەیە جەرگی لە فەیلا
واکەوتوە داماوە لە لافاوگەهی سەیلا
نەی ماوە قەراری لە بیابانی دوجەیلا
«تاهیر وەکوو مەجنوون لە خەیاڵی روخی لەیلا
دێوانە لە سەحراو و سەراسیمە لە توونم»

* * *

## پێنج خشتەکی «صافی هیرانی» لەسەر هەڵبەستی:

« بەخەمزەی چاوی مەخمووری سیاهی مەستی مەی کردین »

---

من و دڵ ئەمرۆ ئەو شۆخە لەخۆشی یەکبەدەی کردین
لە جامی لەعلی سەرخۆش و موقیمی مەیکەدەی کردین
هەتا مەحەشەر خومار و مەستی ناز و نەشئەکەی کردین
«بە خەمزەی چاوی مەخمووری سیاهی مەستی مەیکردین
بە ماچی لێوی موستەغنی لە ئەنواعی مەزەی کردین»

* * *

بە ئەو یارە بڵێن یاران چیە سووچ وگوناهی من
نەسیم ئەنگوت و شەو رۆیی چەمەن والأبوو ماهی من
چ قەماوە مەگەر قوربان کەوا بەستووتە راهی من
«ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵناری بە ئاهی من
کەچی دەستی لە سەر دانا لە سەیری باخی بەی کردین»

* * *

لە بۆ یەک مەرحەبایێ چوومە لای یارم بەسەرخۆشی
نیقابی خستە روخسار و بە جارێ کەوتە خامۆشی
کەوام دی رۆیی ئارامی دڵ و سەبر و فەرامۆشی
«بە هەوری پەرچەم و زولفی، روخ و ئەبرۆی کە داپۆشی
لە شەوقی روئیەتی بەدری هیلالی یەکشەوەی کردین»

* * *

رەفیقانم، کەسێ ئاشق نەبوو لەم سڕڕە نەیزانی
لە لایێ یار حەیاتبەخش و لەلایێ قایێزی جانی
لە هەر دوو لاوە تەسلیمم بڵێن دەستم بە دامانی
«ئەگەر چی کوشتمی خۆ، قابیزولئەرواحی موژگانی
بە قانوونی مەسیحایی بە خەندەی لێوی حەی کردین»

* * *

لە بۆ خوێن رشتنی ئاشق، نیگارم گەرچی بێباکە
وەلێ ئەی دڵ لەرووی ئومیدەوە جارێ تەماشاکە
مەڵێ «صافی» زەمان ئاخر بوو کەس ئیمدادی کەس ناکە
«عیلاجی دەردی دڵ «ناری» لە «تاهیربەگ» تەمەنناکە
بڵێ ئیمڕۆ گوڵەندامێ بەتیرێ جەرگی پەی کردین»

* * *

## پێنج خشتەکی «ناری» لەسەر هەڵبەستی:

## « مەتلەعی سوبحی سەعادەت مەزهەری «علم الیقین» »[١]

---

ئـەی شـەهەنشاهی شکـۆهی عیززەتی رووی زەمـین
گەوهەری تاجی ریسالەت، شەمسی بـورجـی مـورسەلین
زیـــنەتی نـــووری نـــبووەت تـــاجداری مـــوڵکی دیـــن

---

١ ـ بەرێز کاکەی فەللاح لە دیوانی ناری کە لە ساڵی ١٩٨٤ی زایینی لەچاپ دراوە دەڵێ: ئەم پێنج خشتەکی‌یە واباوە کە لە سەر شیعریکی تایەربەگی جاف لە لایـەن ناری‌یەوە دانراوە بەڵام راستی‌یەکەی ئەوەیە کە هەمووی لە دانانی « ناری »یەو هیچ پەیوەندی‌یەکی بە تایەربەگەوە نیە بەڵگەش بۆ ئەمە، نووسینەکەی عەلی‌کەماڵ باپیرە لە گۆڤاری سلێمانی‌دا و شایەتی بەرێز حاجی مەلائەحمەدی قـازی شـاعیر و زۆر لە هاوچەرخانی «ناری» کە خۆی بۆی باس کردوون.!

«تاهیربەگ لەگەڵ ناری پێوەندی نامەنووسینی زۆری بووە من پێم وایە ئەمەیش یەکێ لەو شیعرانە بووە کە تاهیربەگ بۆ ناری ناردوە و لە نـێو دەس‌نـووسەکـانی نـاریا دۆزرایێتەوە. چونکوو مامۆستا عەلائەدینی سەجادیش ئەم شیعرە بەهی تـاهیربەگ ئەزانێ» بەڵام هەمووی دەگەرێتەوە بۆ سەر هەژاری و «هەتیوبوون»ی کورد بە هۆی نەبوونی چاپەمەنی و کاغەز نەتەنیا تێ کلاو بوون بەڵکوو هی زۆربەشیان لەناو چوون.
ح.ح ـ گ».

«مەتلەعی سوبحی سەعادەت مەزهەری «علم الیقین»
ئەی سپە سالاری فەوجی ئەنبیاو و مورسەلین»
* * *
ئەی شەوی ئەسڕا مەلەک خورڕەم لە بۆ ئاهەنگی تۆ
عەرش و کورسی بووبە تەخت و مەسنەدی ئەورەنگی تۆ
گوڵشەنی جەنەت خەجاڵەت ما، لە جیلوەی رەنگی تۆ
«بۆ نەوازش زاتی حەق هەم سوحبەت و هەم دەنگی تۆ
شاهیدی تەعزیمی تۆ بوو، یاوەری رۆحولئەمین»
* * *
پڕتەوی بەدری جەماڵت، شەمعی جەمعی ئەنبیا
زینەتی حوسنی کەماڵت سۆزی شەوقی ئەولیا
گەردی نەعلەینت بەڵێ، رەونەق شکێنی تووتیا
«مسکە تۆزی دامەنت، عەتری دەماغی ئەتقیا
یەعنی بۆ تەئسیری بینش عەینی سورمەی خاکبین»
* * *
مەن گەداو و بێنەوا، تۆش خاوەنی گەنج و کەریم
مەن نەخۆش و بێدەوا، تۆی دەوابەخش و حەکیم
چی لە هەنگامی جەزاکەم، بێ هەواخاه و نەدیم
«روو لە کێ کەم غەیری تۆ، ئەی شافعی زومرەیئەسیم
مەن گونەهبار و خەجاڵەت، تۆی شەفیعوالموزنبین»

با بکەم شیوەن لە داخی باخی عومری بێ سەمەر
دابنیشم دەستە ئەژنۆ وەک هەتیوی بێ پەدەر
تا بە ئەشکی دیدە تەڕ کەم خاک و خۆڵی راگوزەر
«خۆ لە قوڕ بگرم بەجارێ هەر لە پێ تا تەوقی سەر
بەڵکوو لوتفی شاهی لەولاک بێ نەجاتم دالەشین»

* * *

شەرمەزار و سەرفگەندە و غافڵ و دێوانە خۆم
بێ شوعاعی مەعریفەت، بێ نوور و بێ پەروانەخۆم
ئەی بە ریسوایی لە کووچەی شاردا ئەفسانە خۆم
«موستەحەققی تیر و تانەی ئاشنا و بێگانە خۆم
واجیبی رەحمم بەسە یارەحمەتەن لیلعالەمین»

* * *

بووردەباری دەستی نەفسی کافری ئەممارە خۆم
بێ زەخیرە و زادی رێگەی ئاخیرەت بێچارە خۆم
رووت و قووتی مەحشەر و بێ سایەو و ئاوارە خۆم
«دەستە پاچە و رووسیاه و عاجز و بێکارە خۆم
بێ بە فریادم لەوێدا یا دەلیلەلموجریمین»

* * *

من کە مەشهوورم بە مەحکووم و موتیعی نەفسی شووم
کەی بە ئوممید و خەیاڵی ئیعتبار و ئابڕووم
قەت لە خەرمانی ئیتاعەت یەک قەدەم پێشۆ نەچووم
«ئیستە من قانیع بە خۆشەی ئایەتی «لاتقنطوا»م
مەزرەعەی عەفوی خودا نابێ ببێ بێ خۆشەچین»

* * *

بێ نەسیبی کەعبەتوڵڵاو و تەوافی خاکی تۆم
دوور و بێ بەهرەی مەدینەی خاکی عەنبەرناکی خۆم
ئەی ئەسەف، مەحروومی زومرەی حەزرەتی لەولاکی خۆم
«حەسرەتا مەحروومی شەهدی زیارەتی شەبباکی خۆم
بۆ نەڕێژم ئەشکی ئاڵ و ئاوی گەرم و ئاتەشین»

* * *

گەر سەگێ دوای فەوجی خاسانی خوایی کەوتووە
یانێ دەربارى دەری ئەصحابی کەهفی گرتووە
ئەو لە جەننەتدا مووقیم و من لە دۆزەخدا بووە
«ئەی حەبیبی خالیقی عالەم تەرەححوم تا زووە
ئەوسەگی ئەصحابی کەهف و من سەگێکی تابیعین»

* * *

«نـاری»یـا ئـامادە بـە نـزدیکە هـەنگامەی سـەفەر
مـــەنزڵت دوور و درێـژ و چـۆڵە ڕێگـەت پـڕخەتەر
تابەکەی غەفڵەت نشـینی خـاکی، ئەی خـاکت بەسەر
«ڕوو لە قــاپی مـوستەفاکـە بـێژە یـا خـەیرولبەشەر
نـیمە تـۆشەی ڕێگـە جـوز ئیخلاسی ئالی «تـاهیر»ین

* * *

## پێنج خشتەکی «ئەدیب» لەسەر هەڵبەستی:

«ئەی پەرتەوی رەنگت وەکوو رەنگی هەمە رەنگە»

---

لاحەولە لە سەرتا بە قەدەم دڵبەر و شەنگە
بۆ جەزبی دڵی ئاشیق، ئیشقت چو نەهەنگە
پەنجەت کە بە خوێنرێژی دەڵێ شێر و پەڵەنگە
«ئەی پەرتەوی رەنگت وەکوو رەنگی هەمە رەنگە
خاڵت بە مەسەل زوڵفی سیاهت شەوەزەنگە»

* * *

ئاشووبی زەمەن زێبی چەمەن سونبوڵی خۆشبوو
گێسووی و برۆی نازیر و حەیرانە بە هەر سوو
ئەو سەروی قەد و سیم تەن و مەهوەشی گوڵڕوو
«بەزم و تەرەب و بادەو و ساقی مەیە فەرموو
دەنگی دەف و ناڵەی نەی و ئاوازەیی چەنگە»

* * *

بـــیمارە دڵـــم تـــەنگە وەکـوو خـونچەیی زارت
بـوو بـاعیسی مـەخمووریی مـن، چـاوی خـومارت
خـەجڵەت دەرە بۆ حـور و پـەری حـوسنی ویـقارت
«سـەد نـاوی خـودا بـێ لە دوو پـوستانی هـەنارت
گــرد و شـلک و نـاسک و پڕ چـنگ و قـەشەنگـە»

* * *

جـــارێکی لە عـــوشاقی نـــەپرسی چـــیە حـــاڵی
دووری تـۆ دەچـێژێ بـەسە ژەهـر و خـەم و تـاڵی
بـــێچارە بـــە تـــیری تـــۆ بـــریندارە دەنـــاڵی
«لێـوت کـە وەکـوو لەعـلی بـەدەخشانە بـە ئـاڵی
گـــەنجوورە نگـەهبان و دەهـانی دەمـی تـەنگە»

* * *

رووت شـەمسە کـە سـەر تـازە وەدەر دێـنی لە خـاوەر
شـوعلەی لەسـەر ئـافاقی مـەلاحەت وەکـوو داوەر
فـــەرماندەهی ئـەبرۆیی خـەمت ئـامێرو و یـاوەر
«تـابووری مـوژانت لە گـەڵ ئـەگـریجە بـەرابـەر
وەســـتاوە ئـەڵێی لەشکـری ژاپـوون و فـەرەنگە»

* * *

چـــاوم کـــە لە مـــوشتاقی رووت بـــۆتە بـــە دەرمـــان
وا چـــــــــاوەڕێو والەو و گـــــــریانە دوڕ ئـــــــەفشان
مـــەزلوومە ئـــەسیری تـــوە مـــەحکوومە بـــە فـــەرمان
«مـــورغی دڵـــم ئـــەر خـــەستەو و خـــوێنینە بەقوربان
پـــــێکراوی مـــوژەی تـــۆیە نـــە کـــوژراوی تـــفەنگە»

* * *

رووت جەننەت و حوسنت مەلەک و ساحریەت جـن
بـــــۆ هـــــالەیی دەوری قـــــەمەرت کـــافر و مـــوئمێن
نـــاوەستێ لە بـــەر تـــیری غـــەمت جـــەوشەنی ئـــاسن
«چـــــاوت بـــــە مـــەسەل ئـــافەتی دڵـــهایە وەلیکـــن
بـــۆچ وایـــە کـــە ئەبرۆیی کـــەچت مـــەیلی وەجـــەنگە»

* * *

بـــــۆ دیـــــتنی ئـــــەم رۆژە زەمـــــانێکە لە ســـەر رێـــم
قـــەولێ لە کـــەرەم دا بـــە مـــە فـــەرموو کـــە شـــەوێ دێـــم
حـــازر بـــێ مـــەی و ســـاقی و پـــەیمانە لە گـــەڵ جێم
«عاجز بوو کە رووم خستە بەریی پـێ و ووتـی پـێم
ئـــەی ئـــەبلەهە! کـــەی مـــاڵشی ئـاوێنەو و سـەنگە؟»

* * *

بەو شەهدی لەبت تفڵی دڵم چون بووە موعتاد
حەیرانە بە کێویی غەمەوە عاجیز و ناشاد
یەک دەم بە دەمی غونچەیی شیرینی بکا یاد
«سەرگەشتەو ئاشوفتەیی ئیشقم وەکوو فەرهاد
کێوی بەدەن و سینەیە، سەر پەنجە قوڵەنگە»

* * *

ئینسافە بە هەوری، وەرە ئەم پەردە مەپۆشە
بەم نەرگسی شەهلا بەسە، عیشوە مەفرۆشە
باکی چ بە شیرینە «ئەدیب» مایلی نۆشە
«مەنعی مەکە «تاهیر» کە ئەگەر مات و خەمۆشە
دیوانەیی روی تۆیە نە مەستی مەی و بەنگە»

* * *

## پێنج خشتەکی «جەریحی» لەسەر هەڵبەستی:

## « ئەی پەرتەوی رەنگت وەکوو رەنگی هەمە رەنگە» (١)

---

ئەی ناڵەیی دەنگت وەکوو دەنگی هەمە دەنگە
بۆ زەردی روخت قەلب و دڵم عاجز و تەنگە
مەجرووحی موژەی تۆیە نە مەجرووحی پڵەنگە
«ئەی پەرتەوی رەنگت وەکوو رەنگی هەمە رەنگە
خاڵت بە مەسەل، زولف و سیاە و شەوەزەنگە»

* * *

ئەی قاتلی عوششاق، بە تیری روخ و ئەبروو
ئەی زولف شەبە، کولمە مەهـ و شەهیدی خۆش‌روو
ئەی بۆ سەمەن و قامەت و قەددت بە مەسەل موو

---

١ - ئەم تەخمیسەمان لەکتێبی «ناڵەی جەریحی» چاپی ١٣٧١ی ئینتشاراتی سەلاحەدین دەسکەوت کە هێندێ جیاوازی هەیە لەگەڵ شیعرەکەی تاهیربەگا، ئێمە هیچ دەسکاری‌یەکمان نەکرد و دەقی تەخمیسەکەی جەریحی‌مان چاپ کردووە.

«بـەزمت تـەرەب و بادەیی ساقی مـەیی بەزموو
دەنگی دەف و نـاڵەی نـەی و ئـاوازەیـی چـەنگە»
* * *

مـەعدوومە لە دونـیایە مـەسەل زولف و جـەماڵی
هـەرزانـە بـە مـوڵکی عـەجەم و ڕۆم، دوو خـاڵی
سـەر تـا بـە قـەدەم غـەرقی زەڕ و دوڕڕی لوئـاڵی
«لێـوت کـە وەکـوو لەعلی بەدەخشانە بە ئـاڵی
ڕەنجوور مەکـە بـەینی دەهـان، غـونچەیی تـەنگە»
* * *

ڕوونـاکـی هـەموو عـالەمە ئـەبساری سـتارت
مـەحبووبی عـەجەم، ڕۆم و فـەرەنگە، گـوڵی زارت
عـالەم هـەموو پـڕ نـوورە بـە ئـەنواری نـیگارت
«شـیر نـایی لە شـەککـەر پترە شـەکـری کـەلامت
گـرد و شـلک و نـاسک و پڕ چـنگ و قـەشەنگە»
* * *

ئەو ڕۆژە کـە پێم گـوت سـەنەما پـرسە لە مـن کـێم
سـەودا زەدەیـی ئـیشقم و ئـێستاکـە لە سـەر ڕێـم
ماچ کەم قەدەم و گەردی ڕەهت فـەرموو هـەتا بـێم
«عاجز بوو کە رووم خستە بەری پـێ و گـوتی پـێم
ئـەی ئـەبلە بـڕۆ مـاڵشی ئـاوێنە بـە سـەنگە»

شـەیدای روخت شـاه و وەزیـر حـاکـم و یـاوەر
ئـەشغاڵی دڵ و دیـن کـە دەگـەی یـاری دڵ ئـاوەر
بـۆ کـوشتنی عـوششاق روخت جـوملە سـەراسـەر
«تـابوری مـوژانت لە گـەڵ ئـەگـریجە بـەرابـەرژ
وەسـتاوە دەڵـێ عـەسکەری ژاپـۆن و فـەرەنگە»

* * *

ئـــەبساری روخت جــابر و رەعــنایە، وەلەیکـەن
قـــەیتانی لەبت قـــیمەتی دونـــیایە، وەلەیکـەن
کـوڵمت عــەجەبا شـیشەیی سـەهبایە، وەلەیکـەن
«چـاوت بـە مـەسەل ئـافەتی دڵهایە، وەلەیکـەن
بۆچ وایە کە ئەبرۆی کەچی تـۆ مـەیلی وە جـەنگە»

* * *

مـەنعی مـەکـە چاوم کـە دەکـا، نـاڵەو و گـریان
سـەرمەست و سـەراسـیمە و حـەیرانـە لە هـیجران
بـۆ قـامەتی دڵ جـۆیی تـۆ پـەیوەستە بـە قـوربان
«جـیسم و دڵـەکـەم خـەستەو و خـوێنینە بـەقوربان
پـێکاوی مـوژەی تـۆیە نـەکـوژراوی خـەدەنگە»

* * *

لەو وەختە دەکەم بۆ قەدی شیرینی تۆ فەریاد
یەک دەفعە نەبوو بێ ئەسەف و ساکت و دڵشاد
ئاخر بەسە، روحمی بکە ئەی مەهوەشی فەرجاد
«تەن خەستەو و ئاشوفتە و عیشقت وەکوو فەرهاد
کێوم بەدەن و سینە و سەر پەنجە قوڵەنگە»

* * *

وەک وامیق و مەجنوون، «جەریحی» بە خرۆشە
دڵ پڕ لە غەم و خەستەو و شێواو و نەخۆشە
تا جارێ نەفەموی وەرە ئەم بادە بنۆشە
«مەنعی مەکە «تاهیر» کە وەها مات و خەمۆشە
دێوانەی رووی تۆیە نە مەستی مەی و بەنگە»

* * *

